سالی حەوتەم

81

ئازاری ٢٠١٥

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

## بۆچی هاتم

## مژده ... بەهار هاتەوە!

## لەگەڵ هەیبەتی شاعیردا

## داهێنەرو داهێنان

## تامی تاڵی ستەم!

## خوایە وەتەن ئاواکەی...

## لە ماڵەکەماندا یاسا هەیە!

تەنها گەشبینەکان، خاوەنی ئەم

جیهانەن.. ڕەشبینەکان، تەنها

تەماشا دەکەن!!



No: 81

خاوەنی ئیمتیاز

ئەندازیار:

مەسعود تـاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر

عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین

بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فــــارس

زاهــیـــــر زانـــــا

محەممەد مێرگەیی

محمد هاشم محمد

وەهــاب حەسـیب

یەحیــــا محەممەد

گوڵان حەمەئەمین

ڕاوێژکاری یاسایی

پارێزەر:- ئازاد محێدین

بەشی هونەری و دیزاین

پشتیوان عبدالرحمن

تایپ

کلسوم جەلال



ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-
نهۆمی چوارەم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر

٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

bryarmagazine



دابەشکردن

کۆمپانیاى پەیك/ 07708649210

چاپ

کۆمپانیاى پیرەمێرد

# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی حەوتەم - ژمارە 81 - ئازاری 2015






14



12



6

## کارگێڕیو بازاڕسازی

# مژدە ... بەهار هاتەوە!

له هەر بارودۆخێکدا دەژی، هەر کێشـەیەکت هەیە، سەرقاڵی هەر گرفتێکی، لە ژوورەکەت وەرە دەرێ، ئەوا سەرەتای ڕۆژەکانی بەهـارە، مەهێڵە هیچ شـتێك، لە خۆشـیی ئەم بەهـارە جوانە، بێبەشت بکات!

چاویلکەی ڕەشـبینی فڕێدەو بە چاوەکانی خۆت، جوانترین تابلۆ ببینە، تێر بۆنی نێرگزو گوڵەباخ هەڵمژە، سییەکانت پڕکە لە هەوای پاك، لۆچی نێوچەوانت بسڕەوەو لێوت بە خەندەیەکی ئەرخەوانی برازێنەوە!

ژیان ناوەستێ، مەهێڵە چرکەکان بە خەمو پەژارەوە بەسەر چێ!

ماڵاوایی لـە خەمەکانت بکەو گەشـبینانە بڕوانە، دڵنیابە؛ هەموو دەوروبەر، بەجوانی دەبینی!

دڵنیـام ژیانت ڕووداوی ناخـۆشو بەئازاری زۆر تێدان، بەڵام ئەوانە، بەسـەرچوونو ڕۆیشـتن، لە ئەلبوومـدا هەڵیان مەگرەو هەموو ڕۆژێ، پرسەیان بۆ دامەنێ!

تۆ زۆر لەوە گەورەتری، کە ڕەشەبای ڕۆژگار بتوانێ خونچەی هیـواو خۆزگـەو ئاواتەکانت بژاکێنی، بە ڕازیبـوون بە قەدەری خوداییو ویسـتو ئیرادەو هیـواو عەزیمەتو بڕیـاری ئازایانە، دەتوانی گەشبینترین مرۆڤی سەر زەوی بیت!

زۆرجـار گرفتەکان، خەڵاتمان دەکەن، تەماشـا بکە؛ لە دێر زەمانەوە گوتراوە: ئەوەی شـتێکی نەبێ، ناتوانێ بیبەخشێ (فاقدُ الشَّيءِ لا يُعطِي)، بەڵام ئەمە بە ڕەهایی وا نییە، ئەوەی مەحرومە لە حەنانو سـۆزو خۆشەویسـتیو باوەشی میهرەبانی، لە هەموو کەس سۆزو حەنانو میهرو عاتیفەی زێترە!

سەختیی ڕۆژگار، بە وانە قورسەکانی، شتی گەورەمان پێ دەبەخشن.

گرنـگ ئەوەیە؛ تۆ بڕیاری خـۆت بدەیتو لە ئامانجی خۆت پەشـیمان نەبیتەوە.. مەترسـە، کاتێك بڕیارت دا، لێی پاشـگەز مەبـەوە، بەڕاسـتی بزانەو لێـی دڵنیابە، کاتێك تـۆ بە تەواوی قەناعەتـەوە، ئـەو بڕیارەت داوە، دەسـتی پێوە بگرەو سازشـی لەسەر مەکە، دڵنیابە هەرچەندە دژایەتیت بکەن، پاش ماوەیەك، قەیرانەکە کۆتایی پێ دێت!

هەموو دەزانین، کە -کارتەر-، کەسێکی زیرەكو لێهاتوو بوو، بەڵام بەهۆی دوو وشـەوە، بانگێشەی هەڵبژاردنی دۆڕاند، چونکە لە وتارەکەیدا گوتی: ئەمریکا بەرەو ئایندەیەکی ترسناكو تاریك هەنـگاو دەنێت! لەبری ئەو کەسـێکی سـادەو سـاویلکەی وەك "ڕێگاکانیـان" هەڵبژارد، چونکە کەسـێکی قسـەخۆشو خاوەنی ڕوانینێکی گەش بوو، بۆ ئایندەی ئەمریکا!

چونکە ڕەشـبینەکان، بە کەڵکی سـەرکردایەتیکردنی گەلان نایەن، بەڵکو بۆ هیچ پۆستێك ناشێن!!

- ڕەشـبینەکان ناتوانـن قورسـایی لێپرسـراوێتی هەڵگرن، هەربۆیە لە زۆربەی کارەکانیاندا شکست دێنن!

- هەمیشـە سـکاڵاو گازندەیانەو فرمێسـکی خـەمو پەژارە دەڕێژن، خەیاڵی ناخۆشو گومانی خراپ، دڵی داگیر کردوون.

هەمیشە هەست بە ئازارو سەرئێشەو بێخەویو ئازاری گەدەو نەمانی ئیشتیهای خواردن دەکەن. پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان لاوازەو ناتوانن بەتەواوی تێکەڵ بە دەوروبەر ببن!

هەمیشـە لۆمەی خۆیان دەکـەنو خۆیان بە خراپو بێکەڵك دێتـە پێش چاو، ژیان لای ئەوان هەر ناخۆشـیو دەردەسـەریو چاوەڕوانکردنی کارەساتی جەرگبڕە!

ناتوانن خۆشـیو هەواڵی خۆشو موژدەی دڵخۆشکەر پەسەند بکـەن، جگە لە داماویو قوڕبەسـەری، ناتوانن باوەڕ بۆ چیدی بکەنەوە!

گەشـبینی، هێزێکە لە ناخدا، جوانییەکـە لە دڵدا، نوورێکە لـە ڕۆحدا.. بێ ئەو هێزە، مرۆڤ لاوازە.. بێ ئەو جوانیو نوورە، مـرۆڤ نابینایەو ناتوانـێ جوانییەکانی ببینێ، بـا لە گەرمەی بەهارییشدا بێ.

بەڵام ئەگەر گەشبینی هەبوو، ئیدی هیچ بەربەستێك، ناتوانێ بەرامبەری بوەسـتێ، هەربۆیە ساڵانە، نزیکەی (٧٢٦) وێنەکێش، تابلـۆ جوانییەکان، بـە پەنجەی پێو ددانەکانیان دەکێشـن، کە نرخیان دەگاتە هەزاران دۆلار، زۆربەی تابلۆکانیشـیان، بە ڕەنگی گەشـبینانە ڕازاندۆتـەوەو گـوزارش لەوپەڕی هیواو گەشـبینی دەکاتو بە نایابترین شێوە کێشراون!

لـە کاتێکدا ئـەو تابلۆیانـە، بەرهەمی کەسـانێکە، کە هەر لە منداڵییەوە، بەهۆی کارەسـاتی جۆراوجۆرەوە، دەسـتەکانیان لەدەسـت داوەو ناچـارن بـە لێـوو ددانو پەنجەکانـی پێیـان، تابلۆکانیان بکێشنو جیهانی پێ برازێننەوە!!

ئـەدی ئێمـە، ناتوانیـن تابلۆیەکی جوان بـۆ ژیانی خۆمان بکێشین؟!

لە کاتێکدا ئێمە خاوەنی دەسـتو پەنجەو چاوو زمانو لێوی ساغین!

بەڵام سـەرەتا، با لە ناخماندا تابلۆیەکی جوان بنەخشێنین، لەم بەهارەدا دڵمان بکەینە هەمیشـە بەهار! چونکە بەهاری دڵە گەشەکان؛ هەرگیز زەردنابێ...!!



# کارگێڕی
## بە گـــوفتار

ئەو کاتەی لە کارەکەمدا، تەنها کاتژمێرێک بەفیڕۆ دەدەم، وا هەست دەکەم، دزیم لە هەموو مرۆڤایەتی کردووە!

پاستۆر

ئامۆژگارییەکانی پیری، وەکو خۆرەتاوی زستانە، ڕووناکیت پێدەبەخشێت، بەڵام گەرمت ناکاتەوە..

فۆفتارگ

کەسە دەروونبەرزو بەهێزەکان، لە ئارەزووبازی دوور دەکەونەوە، هەروەکو چۆن کەشتییەوانەکان، لە تاشە بەردەکانی نێو دەریا دوور دەکەونەوە.

ناپلیۆن

لە گوێگرتندا، حیکمەت بەدەست دەهێنی، لە قسەکردنیشدا، پەشیمانی!

پەندێکی ئینگلیزی

کاربکە بۆ دونیات، وەکو ئەوەی هەرگیز نامریت، کاربکە بۆ دواڕۆژت، وەکو ئەوەی سبەی دەمریت!

پێشەوا عەلی



# سەرچاوەی ترس، وەهمو خەیاڵە!

دەگێڕنەوە، کۆمەڵە شێرێك، لە یەکێك لە جەنگەڵستانەکانی ئەفریقیادا، بە فیـــزو لووتبەرزییەکی زۆرەوە دەهاتنو دەچوون، بەڵام کاتێك پیربـــوونو ددانەکانیان کەوتنو هێزوتوانایان نەما، شێرە لاوو تازە پێگەیشتووەکانیان بانگ کردو پێیان گوتن:

ئێمە زێتر لە ئێوە شـــارەزای ژیانین، بەڵام ئێستا پیربووینو توانای ڕاوکردنو ڕەدوونانـــی نێچیرانمان نەماوە، وەلێ دەزانین، کـــە هەمیشـــە نێچیرەکان، لە ســـەرچاوەی تـــرس ڕادەکەن، هەر لەبەرئەمە، پلانێکی تۆکمەمان داناوە!

پیرە شـــێرەکان، لە لایەکـــی دارســـتانەکەوە، خۆیان حەشـــارداو دەســـتیان بە نەڕەی شـــێرانەی خۆیان کرد، مامزەکانیـــش کاتێ گوێیان لەم دەنگە بوو، ترســـانو بە ڕاکـــردن بـــەرەو ئاڕاســـتەی پێچەوانە بـــە دەنگی نەڕەی شـــێرەکان، هەنگاویان نا.. بەبڕوای خۆیان، لە سەرچاوەی مەترســـییەکە دوورکەوتوونەتـــەوە! بـــەڵام نەیاندەزانی، کـــە ئەوان بەم کارەیان، نەك لە ســـەرچاوەی ترس دوور کەوتنەوە، بەڵکو بەرەو مەرگی خۆیان هەنگاویان نا!

چونکە لەم بەری دارســـتانەکە، شـــێرە لاوەکان چاوەڕوانیان دەکـــردنو ئەوەی کە لـــە خەیاڵیاندا نەبـــوو، ڕووی دا! ئەوان لە ســـەرچاوەی ترس ڕایـــان کرد، بـــەڵام نەیانزانی؛ بەرەو ترســـی ڕاستەقینەو مەرگی خۆیان ڕادەکەن!!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١. زۆرجار ســـەرچاوەی ترســـەکانمان، تەنها وەهمو خەیاڵەو ئەوەی ئێمە لێی دەترسین، سەرچاوەی ترس نییە.

٢. ڕاکردنو دوورکەوتنەوە لە مەترسییەکان، مانای ڕزگاربوون نییە، بەڵکو دەبێت بە بیرکردنەوەو پلانو نەخشەوە، بەرەنگاری مەترسییەکان ببینەوە، نەك لێیان ڕابکەین!

٣. بە ڕاکردن لە مەترســـی، مەترسییەکان وازمان لێ ناهێنن، ئەو کاتەی ئێمە پشتیان تێ دەکەین، ئەوان پێشمان لێ دەگرن!

٤. خەیاڵو ئەندێشـــەکانمان، ترســـەکان گـــەورە دەکەن، زۆرجار ترسەکە، هێندە گەورە نییە، بەڵام خەیاڵی خۆمان، دەیکاتە کابووسو دێوەزمە، بۆیە پێویستە لە وێناکردنی شتەکاندا، واقیعی بین!

٥. گـــەورەکان، خـــاوەن تەمەنو ئەزموونـــەکان، دنیایان لە ئێمە زۆرتر بینیوە، لە ئێمە زۆرتر دەزانن، پێویســـتە سوودیان لێ وەربگرین.

# تەنها بۆ سەرکردەکان

ژیان مۆمێکە، یان بە ئاگرەکەی دەسووتێین، یاخود دەبێت ئاگرەکەی بکوژێنینەوەو لە تاریکیدا ژیان بگوزەرێنین.

لامارتین

بۆئەوەی بە ئاشتی بمرین، دەبێت بە ئاشتی بژین، چونکە نارەحەتی لە مردندا نییە، بەڵکو لە ژیاندایە!

پەندێکی ئیتالی

تەنانەت ئەگەر گیرفانیشت خاڵی بوو، پارێزگاری لە کڵاوەکەت بکە، تا بەسەربەزی بمێنێتەوە!

پەندێکی ئیسپانی

ئازاکان هەمیشە بەپێوە دەمرن!

سعید تقی الدین

کاتێك نازانین ژیان چییە، چۆن دەتوانین بزانین مردن چییە!

کونفوشیوس

ئەو کەسەی ڕەشەبا بڕوێنێت، زریان دەدوورێتەوە.

سعید تقی الدین

ئەو کەسەی هێلکەیەك بدزێ، وشترێکیش دەدزێ!

پەندێکی عەرەبی



# داهێنەرو داهێنان

زاهیری شێخ ڕەزا

**داهێنان چییە؟**

لە کورتترین پێناسەیدا دەتوانین بڵێین: (کردەی هێنانی نوێیە)، بۆئەوەی ئەم پێناسەیە، کەمێك ڕوونتر بێت بۆ خوێنەر، ئەم سێ وشەیە، یەك بە یەك لێیان دەدوێین:

**١- کردە (عملیة: process):** ئەمە بەو مانایەیە، کە داهێنان نە ئیلهامەو نە وەحییە، بەڵکو کۆمەڵێك هەنگاوو قۆناغی کردەییە. سەرەتا خەیاڵە، دوای ئەوە بیرۆکەیەکەو لە دوای ئەوە، بەتەواوی لە مێشکدا دەخەملێت، لە دوای ئەوە، دەبێت بە قسەو دێتە ناو دونیای بیسراوو نووسراو، لە دوای ئەوەش، قۆناغی جێبەجێکردنی ئەو بیرۆکەیە، دەست پێ دەکات.

**٢- هێنان (الإتيان):** هەزاران بیرۆکەت لە مێشکدا بێت، ئەگەر هەر بیرۆکە بێتو نەیەتە ناو جیهانی بوونەوە، هەرچەندە ئەو بیرۆکەیە جوانو بەنرخ بێت، بیرۆکەیەکی نوێو بێوێنە بێت، هەر یەکسانە بە هیچ.

**(بیرۆکە داهێنراوەکان جوانن، کیلۆی بە دە سەنتە، ساتێك بەهایان هەیە، کە جێبەجێ بکرێن.) پیتەر دراکەر**

بیرۆکەی داهێنەرانە گرنگە، بەڵام لەو گرنگتر ئەوەیە، بتوانیین ئەو بیرۆکەیە، لە مێشکەوە بگوازینەوە بۆ ناو جیهانی بەرچاو، خەڵکی بە چاوی سەریان بیبینن‌و ئاماژەی پێ بکەن‌و سوودی لێ وەربگرن.

**نوێ:** هیچ کارێك، پێی ناوترێت: داهێنان، ئەگەر دووبارەکردنەوەی کارێکی پێش خۆی بێت، بەڵکو پێویستە نوێ بێت، بەڵام مەرج نییە؛ ١٠٠٪ نوێ بێت، بەڵکو ئەگەر هەندێك گۆڕانکاری لە داهێنراوێکی پێشوودا بکات، پێی دەوترێت داهێنان.

لەبەرئەمە، ئەو کەسانەی کە تایبەتمەندن لەم بوارەدا، ڕێژەی جیاوازییەکەیان دیاری کردووە، بۆئەوەی بە کارێك بڵێین داهێنان‌و بە یەکێکی دیکە، بڵێین دووبارەو لاسایی.

ئەو ڕێژەی جیاوازییەش، بە ١٥٪دانراوە لە نێوان ئەو شتەی

بووەو ئەو شتەی پەرەی پێدراوەو داهێنانی تێدا کراوە، هەر کات جیاوازییەکە ١٥٪بوو، دەتوانین ئەو کارە، بخەینە نێو لیستی داهێنراوەکانو خاوەنەکەشی بە داهێنەر دابنێین.

(ڕۆحی داهێنان بریتییە لە: کۆکردنەوەی ئەزموونەکانی پێشوو؛ بۆ پێکەوەنانی داهێنراوێکی نوێ) مارش فیشەر

ڕاستییەکی تاڵ:- ڕێژەی داهێنەران: تەمەن پێنج ساڵ ٩٠٪، حەوت ساڵ ١٠٪، هەشت ساڵ ٢٪، چلو پێنج ساڵ ٢٪.

تێبینی بکەن، ڕێژەی داهێنەران لە تەمەنی پێنج ساڵیدا، دەگات بە ٩٠٪، بەڵام بەداخەوە، بە شێوەیەکی ترسناکو خێرا، ئەم ڕێژەیە دادەبەزێت بۆ لە ١٠٪ لە ماوەی دوو ساڵدا. واتە: تەمەنی حەوت ساڵی، پرسیاری گرنگ ئەوەیە: ئەم دابەزینە خێرایە بۆچی؟ چی ڕووی داوە؟ لەو دوو ساڵەدا، چ شتێکی تازەو نوێ، هاتۆتە ناو ژیانمانەوە؟!

وەڵامەکە ڕوونە، لەم تەمەنەدا، منداڵان دەچن بۆ قوتابخانە، ڕاستییەکی تاڵە، بەڵام دەبێت بیڵێین، پەیڕەوو پرۆگرامی فێربوون، لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا، بە شێوەیەکە، بکوژی ڕۆحی داهێنانو داهێنەرانە.

منداڵ پێش ئەوەی بچێت بۆ قوتابخانە، بەئازادی بیر دەکاتەوە، بە ئارەزووی خۆی، خەیاڵ دەکات، چی بوێت، لە بارەیەوە پرسیار دەکات، بەڵام ساتێك، دەچێتە قوتابخانە، گۆڕانکاری ڕوو دەدات، پێویستە لە شوێنێکی دیاریکراو دابنیشێت، ساتێك ویستی پرسیار بکات، دەبێت دەست هەڵببڕێت، نابێت پرسیارێك بکات، پەیوەندی بە وانەکەوە نەبێت، ئەوەی مامۆستا دەیڵێت، ئەوە ڕاستییە، لە کۆتاییدا؛ وای لێ دێت، پرسیارکردن قەدەغەیە، گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوە لەسەر بابەتەکان قەدەغەیە، منداڵەکە وا پەروەردە دەبێت، کە بیرکردنەوە سنووردارە، یاخود وەك ئەوە وایە، پێی بڵێین؛ بێخەم بە، دڵارام بە، خۆت ماندوو مەکە، ئێمە بیرمان بۆ هەموو شتێکی تۆ کردۆتەوە، پرۆگرامێکی تێرو تەسەلمان بۆ داناویت، ڕێگەکەمان بۆ کورت کردویتەوە، تۆ هیچت لە سەر پێویست نییە، تەنها ئەوە نەبێت؛ زانیارییەکان لە بەر بکەو لە تاقیکردنەوەکاندا سەرکەوتوو بە، بیر لە هیچ مەکەرەوەو هەوڵی داهێنان مەدە.

زمانی ژمارە..

ساتێك بەراوردێك دەکەین، لە نێوان داهێنراوەکانی وڵاتانی عەرەبی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەگەڵ وڵاتێکی وەکو ئیسرائیلدا، کە ئەویش هەر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدایە، تووشی شۆك دەبین، لەگەڵ ئەوەی کە وڵاتانی عەرەبی، ڕێژەی دانیشتووانیان پەنجا ئەوەندەی ئیسرائیلە، بەڵام ئەگەر بۆ نموونە: ساڵی ٢٠٠٧ وەربگرین، هەموو داهێنانەکانی وڵاتانی عەرەبی ١٤٧ داهێنانە، تا ئێستەی سەدەی بیستو یەکیش، ٨٣٦ داهێنانە.. بەڵام ئیسرائیل، تەنها لە ساڵی ٢٠٠٨دا، ١١٦٦ داهێنانی هەیە، لەو ساتەشی دامەزراوە، کە ساڵی ١٩٤٨ دەکات، تا ئێستا، ژمارەی داهێنانەکانی ١٦٨٠٥ داهێنانە، ئەمە ڕیکلام نییە بۆ ئیسرائیل، ئەمە ژمارەو ڕاستییە، بەداخەوە.

ساتێك دەمانەوێت لە هۆکارەکانی بکۆڵینەوە، کورتەکەی ئەوەیە، کە پێگەیاندنی داهێنەران لای ئەوان زۆر گرنگی پێ دەدرێتو ئاسانکارییان بۆ دەکرێتو کۆسپەکانیان لە بەردەمدا لا دەبرێت.. بەڵام لە وڵاتانی عەرەبیداو لای ئێمەش لە کوردستان، تەواو بەپێچەوانەوەیە، کۆسپەکان زۆرن؛ بۆ کوشتنی ڕۆحی داهێنان، هاندانو ئاسانکارییەکان کەمن، یاخود هەر نین.

داهێنان پێویستی بە ئازادییە

داهێنان بەبێ ئازادی، بوونی نییە. لە گەورەترین کۆسپەکانی داهێنان، لە وڵاتانی ئێمەدا؛ نەبوونی ئازادییە، یاخود بەرتەسککردنەوەی ئازادییە، چونکە ئازادی، لە هەڵۆی بەرزەفڕ دەچێت، تواناکانی دەرناکەون، تەنها لە ئاسمانی ئازادو فراواندا نەبێت، هەرگیز لە ناو قەفەزدا، تواناو لێهاتووییەکانی بەدەر ناکەون.

لێرەدا تەنها مەبەستمان ئازادی ڕامیاری نییە، بەڵکو هەموو ئازادییەك، کە مرۆڤ پێویستی پێیەتی، لە ماڵەوە دەست پێ دەکات بۆ قوتابخانەو زانکۆ، کۆتای دێت بە شوێنی کارەکەی، جا فەرمانگە بێت، یان کۆمپانیا، یاخود ئێشی ئازادی ناوبازار.

ئەو بەڕێوەبەرەی لە فەرمانگەکەیدا، یان ئەو مامۆستایەی لە قوتابخانەکەیدا، یان ئەو پزیشکەی ڕێگە خۆش ناکات؛ بۆ بیرکردنەوەی جیاوازو داهێنەرانە، پێی بزانێت، یاخود پێی نەزانێت، نەك هەر یەکێکە لە کۆسپەکانی بەردەم داهێنان، بەڵکو بکوژی داهێنانیشە.

ئەنیشتاین دەڵێت: ( ئەوەی گرنگە مرۆڤ ئەنجامی بدات، ئەوەیە ڕێگە خۆش بکات، مرۆڤەکان بەئازادی بیر بکەنەوە)!

تایبەتمەندیی داهێنەران

زانایان بۆیان ڕوون بۆتەوە، کە داهێنان چەند پلەیەکی جیاوازە، داهێنەرانیش مرۆڤن وەکو ئێمە، بەڵام کۆمەڵێك تایبەتمەندیی خۆیان هەیە، کە تێیدا هاوبەشن.

ساتێك زانایان بە دوای وردەکاری ژیانی داهێنەراندا چوونو ویستویانە تایبەتمەندییەکانیان بزانن، کۆمەڵێك تایبەتمەندیان دۆزیوەتەوە، کە زۆربەی داهێنەران تێیدا هاوبەشن، ژمارەی ئەو تایبەتمەندییانە، زیاترە لە ٣٠ دانە.

ئەم تایبەتمەندییانە ئاماژەن، بۆئەوەی خاوەنەکەیان یەکێکە لە داهێنەران.

ئێمە لێرەدا چەند دانەیەکیان باس دەکەین:

١- بیرۆکەی سەیر: تەواوی داهێنەران بیرۆکەی تایبەت بە خۆیان هەیە، زۆرجار ئەم بیرۆکانە، بە بەراورد بە بیرۆکە

باوەکان، لەو کاتو شوێنەدا، سەیرو سەمەرەن، تەنانەت زۆرجار کۆمەڵگا، ئەو بیرۆکانە بە جۆرێك لە شێتی لە قەڵەم دەداتو خاوەنەکانیان بە خەیاڵپلاو دادەنێت.

٢- پەرشوبلاوی: یەکێکە لەو تایبەتمەندییە سەیرانەی، کە زۆربەی داهێنەران، تێیدا هاوبەشن، ئەوان کەسانێکن، بۆ کارە سادەکانی خۆیان، بەتەرتیب نیین، ئەم پەرشوبلاوییە، پەیوەندی نییە بە تەواویی ژیانیانو شێوەو کاتەکانیان، بەڵکو پەیوەندی هەیە، بە پەڕە کاغەزەکانی بەردەستیانو بە شتومەکەکانی ناو تاقیگەکەیان، هەر ساتێك بچیتە ئەو ژوورەی، کە داهێنەر تێیدا دەژی، یان تاقیگەکەی، سەیرێکی کتێبخانەکەی بکەیت، یان سەیری شتومەکەکانی بکەیت، سەرت لەو هەموو پەرشوبلاوییە بەرچاوە سوردەمێنێت، کە چۆن نووسراوو شتەکانی بلاو بوونەتەوە بەو ناوەدا، پێت سەیرە، کە چۆن دەتوانێت؛ سەر لەم شتانە دەربکات، چ جای ئەوەی مێشکی ڕێك بخاتو بیرۆکەی داهێنەرانەی هەبێت.

١- لەبیرچوونەوە: ئەمەشیان یەکێکی ترە؛ لەو تایبەتمەندییە سەیرانەی، کە داهێنەران هەیانە، ئەو شتەی کە زۆر لە بیریان دەچێتەوە، ناوی خەڵکە، ڕێگەی چوون بۆ ئەو جێگایانەیە، کە زۆر دیارن، بەڵام کارە گرنگەکانی خۆیانیان زۆر بەوردیو جوانی لە بیرە، ئەمەش جیاوازی سەرەکیی نێوان لەبیرچوونەوەی داهێنەرانو لەبیرچوونەوەیە، وەك نەخۆشی، پێویستە ئەم جیاوازییە بزانین، بۆئەوەی هەموو کەس خۆی بە داهێنەر نەزانێت.

دەگێڕنەوە: جارێك ئەنیشتاین، سواری تەکسی دەبێت، هەرچەند دەکات ناونیشانی ماڵی خۆیانی بیر نایەتەوە، ناچار بە شوفێرەکە دەڵێت: ماڵی ئەنیشتاین دەزانیت؟ شوفێرەکە دەڵێت: بەڵێ، کەس هەیە لەم شارەدا ماڵی بەڕێز ئەنشتایین نەزانێت! ئەنیشتاینیش دەڵێت: بمبە بۆ ماڵی ئەنیشتاین. بەم شێوەیە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆیان.

٢- ئارامگرتن: داهێنەران بەوە دەناسرێنەوە، کە لە سەر ئەو کارانەی کە خۆیان حەزیان لێیەتیو قەناعەتیان پێی هەیە، زۆر بە ئارامنو هەرگیز ماندوو نابن؛ هەرچەندە خەڵکیش ساردیان بکەنەوەو لۆمەیان بکەن، ئەوان دەستبەرداری بیرۆکەکانی خۆیان نابن.. بەپێچەوانەوە، بەردەوام دەبنو چێژ لە کارەکانیان وەردەگرن، بەڵام لە هەمان کاتدا، زوو تووشی بێتاقەتی دەبن لەو کارانەی کە حەزی پێ ناکەن.

ئەدیسۆن، بەناوبانگە بەوەی زۆر چالاكو تێکۆشەر بووە، بە شێوەیەك، کە هەندێك جار ١٦ کاتژمێر لە شەوو ڕۆژێکدا سەرقاڵی خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوەی زانستی بووە؛ لە تاقیگەکەی خۆیدا، لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا، کە ئایا بەو هەموو کارو چالاکییە، شەکەتو ماندوو نابێت؟ لە وەڵامدا دەڵێت: من ڕۆژانە، ١٦ کاتژمێر کار ناکەم، بەڵکو ١٦ کاتژمێر، سەرقاڵی خۆشگوزەرانیو چێژ وەرگرتنم.

٣- جوانناسی: داهێنەران هەستێکی ناسکی جوانناسییان هەیە، حەزیان لە جوانییە، چێژی لێ وەردەگرن، جوانی لە هەندێك کارو شتدا دەبینن، کە خەڵکی سادە نایبینن، جا ئەو شتە مرۆڤ بێت، یان سروشت، یان تابلۆیەك بێت، یان هەر شتێکی دیکە.

ئێمە بە سەدان جارو زیاتریش سوراحیو پەرداخمان بەکار هێناوەو بینیومانە، بەڵام هەرگیز وەکو چاوەکانی شاعیری کورد؛ پیرەمێرد نەماندیوەو سەیرمان نەکردووە، بەو شێوەیەی ئەو، لێی ورد نەبووینەوە، ئەو جوانیو ناسکییەی چاوەکانی پیرەمێرد دیویەتی، ئێمە نەماندیوە.

چەند جوان دەڵێت:

ئەبێت بەخشندە مل کەچکا لە ڕاستی مووچە خۆری خۆی
سوراحی سەر فرۆ دێنێ؛ لە بۆ پیاڵە، کە تێکا بۆی.

شۆبنهاوەر دەڵێت: (هونەرمەند چاوەکانی خۆیمان پێ دەدات، بۆئەوەی سەیری جیهانی پێ بکەین).

٤- بیرکردنەوەی تەنیا: یەکێکی دی لە تایبەتمەندییەکانیان، حەز دەکەن بەتەنیا بیر بکەنەوە، حەزیان بە بیرکردنەوەی بەکۆمەڵ نییە، ئەگەر داوای بیرۆکەی داهێنەرانەیان لێ بکەیت لە ناو کۆمەڵدا، بیرۆکەی کەمیان لایە، بەڵام هەمان داواکاری، بەتەنیا ئاراستەیان بکەیت، بیرۆکەی زیاتریان لایە. بۆئەوەی بتوانیت سوودمەند بیت لە بیرۆکەی داهێنەران، دەبێت داواکاریو کێشەکەتی بۆ باس بکەیتو دوای ئەوە، بەتەنیا بەجێی بهێڵێت.. ئەگەر پێی بڵێیت: وەرە با گفتوگۆ لەبارەی فلانە شت بکەین، ناتوانێتو بیرۆکەی کەمی لایە، بەڵام ئەگەر بەجێی بهێڵێتو کاتی گونجاوو شوێنی گونجاوی هەبێت، چەندان بیرۆکەو پێشنیاری نایابی لا دەست دەکەوێت.

٥- پرسیاری زۆرو خۆتێهەڵقورتاندن: داهێنەران حەز دەکەن؛ لەبارەی شتە نوێیەکان زانیارییان هەبێت، بۆیە زۆر پرسیار لەبارەیانەوە دەکەن، حەز دەکەن؛ بچنە بنجوبناوانی شتەکانەوەو حەزی زانینی هۆکارەکان لای ئەوان، لە خەڵکی ئاسایی زیاترە، بۆیە هەمیشە، دەم پڕ لە پرسیارن، هەر ئەم هۆکارەشە، هەندێجار وا دەردەکەون، کە خۆ لە کاروباری کەسانی دی، هەڵدەقورتێنن.

هەر بەم هۆیەشەوە، داهێنەران تەنگ بە مامۆستاو پەروەردەکار هەڵدەچنن، بە هۆی زۆری پرسیارەکانیانەوە، بەداخەوە زۆر کات ئەو ڕۆحە داهێنەرە، لە بری ئەوەی پەروەردە بکرێت، لە لایەن بەرامبەرەوە دەکوژرێت.

سود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە: سلسلة علمتني الحياة/ د.طارق السويدان

ن: د. عبدالكريم بكار
و:حسێن نەجمەدین قەرەداغی

# گەشەپێدانی تەواوکاری

## بەشی یەکەم

پێش ئەوەی باسی گەشەپێدان بکەین، پێویستە ئەوە بۆ خوێنەری بەڕێز ڕوون بکەینەوە، کە مەبەستمان لە گەشەپێدانی هەمەلایەنو تەواوکاریی بۆ مرۆڤەکانە، ئەوەی دەمانەوێت، لەم چەند ئەڵقەیەدا باسی بکەین، مرۆڤ سەنتەرو خاڵی سەرەکیی مەبەستو ناوەرۆکی ئەم باسەیە.

پاش جەنگی جیهانی دووەم، لە ئەڵمانیادا، لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنو گشتگیریان کرد، لەسەر هەموو بوارەکانی ژیان، کە جەنگ تێکی شکاندبوو، لە ئەنجامدا؛ زۆربەی ئەو توێژینەوانە هاوڕابوون لەسەر ئەوەی، کە تەنها سامانی مرۆییو سامانی فکریی مرۆڤەکانیان ماوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو سێ پێکهێنەرە گرنگەیان ماوە، کە لەوانەی سەرەوە، سەرچاوە دەگرێت، کە بریتییە لە: (مرۆڤ، خاك، کات) هەموو هیواو ئاواتیان هەبوو، بە هەستانەوەو ئایندەیەکی ڕوون بۆ وڵاتەکەیانو لە ئایندەیەکی نزیکدا لەسەر ئەرزی واقیع، ئاماژەو نیشانەکانی دەرکەوتو تائێستاش ئەڵمانیا، یەکێکە لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی دونیا.

**پێناسەی گەشەپێدان (التنمية):**

لە زمانی عەرەبیدا (تنمية) بەمانای زیادبوون دێت؛ لە چەندێتیو چۆنێتیی شتەکاندا، هەندێك لە زانایان، زیاتر جەخت دەکەنەوە، لەسەر بەرهەمی گەشەپێدانو ئەنجامەکانی، بۆیە پێناسەی گەشەپێدان دەکەن بە: (جووڵاندنی زانستییانەی نەخشە بۆ کێشراوی کۆمەڵێك کارلێکی کۆمەڵایەتیو ئابوورییە، لە ڕوانگەی بیروباوەڕێکی دیاریکراو، بۆ بەدیهێنانی گۆڕانکاریی ئامانجدار بەمەبەستی گواستنەوە لەو بارودۆخەی، کە پەسەندو خوازراو نییە، بۆ ئەو بوارەی کە پەسەندو خوازراوە).

ئەوەی بەدیهاتنی بەرهەمی هەوڵی گەشەپێدانە، بریتییە لە: بەرهەمهاتنی ئامانجو مەبەستەکانی قۆناغی ئێستاو داهاتوو، ئەوەشی کە کۆمەڵگا بۆی دەکۆشێت، کەواتە: گەشەپێدانی تەواوکارو هەمەلایەن بریتییە لە: (کۆمەڵێك هەوڵو تێکۆشانی هەمەلایەنو جۆراو جۆروهاوتا، کە کۆمەڵگە ئامادە دەکات بۆ ئەنجامدانو هەستان بە فەرمانی خودا).

ڕەفاهییەتو تەندروستیو هەلی کارو زانستو ڕاهێنانو سوودوەرگرتن لە کاتی بەتاڵو پێشکەوتنی زانستیو ........هتد، هەموو ئەمانە، بەرەو یەك ئەنجام دەچن، کە ئامادەکردنو بەرزکردنەوەی لێهاتوویییەکانو ڕێکخستنی کەشو هەوای ژینگەییو کۆمەڵایەتی، کە یاریدەدەر بێت؛ بۆ بەئەنجامگەیاندنی مافی بەندایەتی بۆ خودای باڵادەستو هەستان بەئەرکی ئاوەدانکردنەوەی زەوی بە شێوازی تەواوو هەمەلایەن.

ئەم دیدگایە، بۆ گەشەپێدانی هەمەلایەن، نەك تەنها هاوکارمان دەبێت؛ بۆ شێوەگرتنو بەدیهاتنی ئامانجەکانی، بەڵکو زیاتر بەرچاومان ڕووندەکاتەوە؛ بۆ دامەزراندنو بنیاتنانی هاوسەنگیو هەماهەنگیی نێوان لایەنە جیاوازەکانی گەشەپێدان، هەروەها هەوڵو تێکۆشانی زۆرمان بۆ دەمێنێتەوە، لە ئاکامیشدا ئەمە جیهادو تێکۆشانە، بەبێ بوونی دوژمن.

هەروەها ئەم دیدگایە، هاوکاریمان دەکات؛بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی کارە گرنگەکان، لە پرۆسەی گەشەپێدانداو بەڕێوەبردن بە شێوازێکی گەشەسەندوو، ئەو کاتە هاوکارمان نابێت بۆ بەدیهێنانی شتە تەواوکارییەکان، لە کاتێکدا خەڵکی، هەوڵی دەستخستنی پێداویستییە بنچینەییەکان بدات. واتە: زێدەڕۆیی نەکەین لە بنیاتنانی گۆڕەپانی یاریکردندا، لە کاتێکدا پەیمانگاو تاقیگە، پێویستیمان بێت.

**بۆچی گرنگی بە گەشەپێدانی تەواوکاریو هەمەلایەن دەدەین؟**

خودای گەورە، مرۆڤی دروست کردووە، لە ناخو دەروونیدا، کۆمەڵێك ئامانجی باشو خراپ، بوونی هەیە، لە هەمان کاتدا، بۆ تەندروستیو ساغلەمی، مەرجو سنووریی تایبەتی هەیە، بۆ گوزەرانو ژیانی کۆمەڵگەیەکی تەندروستیش، کۆمەڵێ مەرجی تری داناوە. پاش ئەمانەش، کۆمەڵێك فەرمانی بەسەردا کردووە، چەند داواکارییەکی لەسەر داناوە، بۆئەوەی بتوانێت سازانو گونجاندن، لە نێوان مەرجەکانی ژیانێکی شکۆمەندانەو هەستان بەکاری پەیامداریی ڕاستەقینە، لەسەر ڕووی زەوی پیادە بکات، پێویستە لەسەری، کە تێکۆشانێکی زیاتری بیرکردنەوە، لە بواری کارەکەیدا ئەنجام بدات. ئەم پێداویستیانە، زیاتر دەبن، هەر کات بارودۆخی گوزەران خراپترو فشاری ڕۆژگار زیاتر بێت.

**لەبەر ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە، (گەشەپێدانی هەمەلایەنو تەواوکاری) گرنگیی تایبەتی هەیە:**

١- ڕێژەی زیادبوونی دانیشتووان لە جیهانی ئیسلامیدا، لە ئاستێکی بەرزدایە، بە بەراوورد بە وڵاتانی تر. بۆ نموونە: لە وڵاتە عەرەبییەکاندا، ساڵانە (٠،٠٣٣) وەك ڕێژەی زیادبوونی مامناوەند تۆمار کراوە. لە کاتێکدا لە بەریتانیا (٠،٠٠١)و لە ڕوسیا (٠،٠٠٩)و لە فەرەنسا (٠،٠٠٦)و لە ئەڵمانیا ڕێژەی دانیشتووان لە کەمبوونەوەدایە، ڕۆژانە بە (٣٥٠) کەس.

بۆئەوەی قەبارەی زۆربوونی دانیشتووانو ئەو خێراییەی، کە پێی زیاد دەبێت بزانین، ئەوا کۆی دانیشتووانی وڵاتانی عەرەبی، ساڵی (١٤٠٠ ك)، تەنها (١٦١) ملیۆن کەس بوو.

لە ساڵی (١٤٢٠ ك)یشدا، واتە: پاش ٢٠ ساڵ، بەنزیکەیی بۆ (٣٠٠) ملیۆن کەس بەرز بووەتەوە.



و: محەممەد مێرگەیی

# جووتیارێكو سێ ڕاوێژكارەكەی پادشا!

لە سـەردەمی ڕابردوودا، پادشایەك سێ ڕاوێژكاری هەبوو. ئەو سێ ڕاوێژكارە، خۆیان بەلێزانترینو داناترین كەسـی دونیا دەزانی، بەڵام پادشاكە زۆر بڕواو متمانەی بەدانایی ئـەوان نەبوو، بۆیە بڕیاری دا، لە دەرفەتێكدا تاقییان بكاتەوە. جارێكیان پادشا، لەگەڵ ڕاوێژكارەكانی چـوون بۆ ڕاوشـكار. لە ڕێـگادا، جووتیارێكـی پیریان دیـت، كە خەریكی زەوی كێڵان بوو. پادشـا ڕاوەسـتاو تەماشایەكی جووتیارە پیرەكەی كرد، پاشان وتی:

-لە لوتكەی چیا، بەفرێكی زۆر باریوە!

جووتیارەكـەش وەڵامـی دایـەوە: پادشـا ئەوە، لەبەرئەوەیە؛ كاتی بەفربارین هاتووە.

پادشا وتی: چەندجارماڵت سووتاوە؟

جوتیارەكە وتی: دووجار خاوەنشكۆ!

دواتـر پادشـا گوتی: ئـەی چەندجـاری دیكەش دەسووتێت؟

جوتیارەكە لە وەڵامدا گوتی: سێ جار!

پادشا: چی دەڵێی ئەگەر سێ قازی گێلت بۆ بنێرم؟ ئایا دەتوانی بەتەواوی تووكەكەیان لەبەردامالێت، تاوەكو ڕووت دەبنەوە؟

جوتیارەكە زەردەخەنەیەكی كردو وتی: هەرچەندی دەنێرن، بنێرن.. بەباشی تووكەكەیان دادەماڵم!

پادشـا ماڵئاوایی لە جووتیارەكە كردو ڕۆیشـتن.

هەرزوو پادشا لە ڕاوێژکارەکانی پرسی:

- ڕاوێژکارەکانــی من.. ئێستا کاتی ئــەوە هاتووە؛ دانایی خۆتان پیشــان بدەنو بیسەلمێنن. بزانن من چیم لەو جووتیارە پرســی، مانای پرسیارەکانی من، چی بوو؟ وەڵامەکانی ئەویش، مانای چی بوون؟ ئەگەر نەزانن، ئەوا فەرمان دەکەم سزا بدرێنو لە ڕاوێژکاری دوور بخرێنەوە!

ڕاوێــژکارەکان لــە نێــوان خۆیانــدا، کەوتنــە دەنگەدەنگو قسەکردن:

-ئایا هەر ئێســتا! ئەمە ئەستەمە! دەبێت سەرەتا بیری لێ بکەینەوە!

پادشا لەسەر ئەمە ڕازی بوو، پێی وتن باشە! بەڵام ئەگەر لە ماوەی ســێ ڕۆژدا نەتانزانی، ئەوا ســزاکەتان جێبەجێ دەکەم.

ڕاوێــژکارەکان چــوون لاپــەڕەی ســەدان کتێبیان هەڵدایەوە، بەڵام لە یەك کتێبیشــدا هیچیان بەدەســت نەکەوت. دواجار هیچیان پێنەما، ئەوە نەبێت؛ بچنەوە لای ئــەو جووتیــارە پیرەی لە ڕێگەدا، پادشــا قســەی لەگەڵدا کرد، پێیان وت:

- پیرەمێــرد وەرە پێمــان بڵــێ، مانــاو مەغزای پرسیارەکانی پادشاو وەڵامەکانی تۆ چی بوون؟ ئێمەش پاداشتێکی باشت دەکەین.

- باشە.. پێتان دەڵێم، بەڵام لە بەرامبەردا دەبێت؛ ئێــوە جلوبەرگە بەنرخەکانی خۆتان دابکەنو بیاندەن بە من!

ڕاوێژکارەکان بەسەرسوڕمانەوە پێیان وت:

- تۆ چ پێویســتیت بــە جلوبەرگی ئێمەیە؟ ئێمە پارەت پێدەدەین.

پیرەمێرد بەپێداگرییەوە وەڵامی دانەوە: نەخێر پێویســتم بــە پارە نییــە. ڕاوێــژکارەکان، کــە زانییان پیرەمێــرد ڕازی نابێــتو هەوڵدان لەگەڵیدا بێســوودە، بەناچاری جلوبەرگەکانی خۆیان پێدا، ئینجا لێیان پرسی:

- ئێستا با بزانین.. پادشا باسی کامە بەفری سەر لوتکەی چیای دەکرد؟ خۆ لەو کاتەدا، شاخەکان بەفریان لەسەر نەبوو؟

جوتیارەکــە وتــی: پادشــا مەبەســتی لــە مووە سپییەکانی سەری من بوو، وەڵامی منیش ئەوەبوو، کە پرچم ســپی بووە؛ چونکە تەمەنم چووەتە سەرو پیر بووم.

ڕاوێــژکارەکان: ئــەی بۆچی وتت ماڵــت دووجار سووتاوەو سێ جاری تریش دەسووتێت؟

جوتیارەکە وتی: پادشــا لێی پرسیم: چەند کیژم شــووی کردووە، منیش پێموت دوو، چونکە بەشوودانی کچ، وەك بنیاتنانەوەی ماڵە، لە دوای سووتانیدا.

من ئێستا سێ کچی ترم هەن، چاوەڕێی شووکردنن. واتە: دەبێت سێ جاری تر ماڵەکەم درووست بکەمەوە.

ڕاوێژکارەکان وتیان:

-ئــەی ئەو قــازە گێلانە چین، کە پادشــا بەڵێنی پێدایت؛ بۆت بنێرێت، تۆش تووکەکەیان دابماڵیت، تاکو ڕووت ببنەوە؟

پادشــا کە خۆی لە نزیکیانەوە حەشاردابوو، ئیتر خۆی پێنەگیراو وتی:

-ئەو سێ قازە گێلەش.. ئێوەن، نابینن جووتیارەکە، وەکــو قــاز ڕووتــی کردوونەتــەوەو جلوبەرگەکــەی لێسەندوون؟!

پادشــا بەنهێنی کەوتبــووە دوای ڕاوێژکارەکانیو گوێــی لــە هەمــوو قســەو گفتوگــۆی نێوان ئــەوانو جووتیارەکە بوو.

ڕاوێژکارەکان، خۆیان هاویشتە بەرپێی پادشاو لێی پاڕانەوە.

-باشە، لێتان خۆش دەبم، بەڵام دەبێت لەبەرامبەر ئەمەدا، سێ جار ماڵی ئەو پیرەمێردە بسووتێنن!

ڕاوێــژکارەکان ســەریان ســوڕما: ســێ جــار ماڵ سووتاندن؟ چۆن؟

جووتیارەکە بەپێکەنینەوە وتی:

-واتە: پێویستە ئێوە تێچووی شووکردنی هەر سێ کچەکەم لەئەستۆ بگرن.

بەمشێوەیە هەر سێ ڕاوێژکارە گێلو دەبەنگەکەی پادشا، هەموو خەرجیی شووکردنی ســێ کچەکەی جووتیارەکەیان لەئەستۆ گرت، بۆئەوەی لە سزاکە ڕزگار ببن.

سەرچاوە: گۆڤاری (العربی الصغیر).




# بازاڕسازی بەشێوەی ڕایەڵە

**وەهاب حەسیب محەمەد**

هەرێمی کوردستان، ئەمڕۆ ناوەندێکە بۆ ساغکردنەوەی کاڵاو شمەکی گەلێ وڵاتانی دنیا، نەخاسمە وڵاتانی دراوسێ، زۆربەی هاوردەکاران، لە هێنانی کاڵاو شمەکەکاندا، هێندەی چاویان لە قازانجی خێرایە، هێندە کەڵکی ئابووریو مانەوەیان لە بازاڕدا، مەبەست نییە.

بە خاتری ئەو بیرکردنەوانە، دەبینین کاتێک بازاڕ، تووشی داکشان دەبێت، واتە: توانای کڕینی بەکاربەر، بە هەر هۆکارێک کەم دەکات، یاخود ئابووریی وڵات تووشی ئاستەنگێک دەبێت، زۆرێک لە کۆمپانیاکان بەرهەمەکانیان لێدەبێت بە بارێکی گرانو هەندێجار بە هەر نرخێک بێت، گەرەکیانە لە کۆڵی بکەنەوە، ئەم کارەش کۆمەڵێک گرفتی لێدەکەوێتەوە؛ دیارترینیان زەرەرو زیانی ئابوورییە، کە توانای کۆمپانیاو خاوەن بەرهەمەکە لە ناوەندی ڕکابەری بازاڕ، دووری دەخاتەوە، یان هەندێجار بە تەواوی نابووتو مایە پوچی دەکات.

لە مێژە، گەلەک کۆمپانیاو خاوەن بەرهەم، بەتایبەت ئەوانەی پایەی ئابوورییان پتەو نییە، یان توانای ئابوورییان بەهێز نییە، بە مەبەستی بەهێزکردنی توانای ڕکابەریو مانەوەیان لە بازاڕدا، بیریان لە شێوازی نوێی فرۆشتن کردۆتەوە، بەتایبەت دوورکەوتنەوە لەو لایەنانەی، کە وەک تێچوون، دەچێتە سەر بەرهەمەکانی (بۆ نموونە: بانگەشەو ڕاگەیاندن). هاوکات بەگەڕخستنی ئەو کەسو لایەنانەی کە بێکارن، یاخود کاتی بەتاڵیان زۆرەو سەرمایەو داهاتیان دیاری کراوو کەمە؛ وەک: خانەنشینان، قوتابیان، کەسانی دەستگێڕو ... هتد. ئەو شێوازەش، کارکردنە لە بازاڕی کاردا، یاخود بازاڕسازییە بە شێوەی تۆڕ، واتە: دروستکردنی ڕایەڵەیەک؛ لە خەڵک لە یەک کاتدا، کڕیارو فرۆشیار بێت، هاوکات لە ڕێگای کارەکەوە، تۆڕێک لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی درووست بکات، لە نێوان ئەو کەسانەی لەو نێوەندەدا کۆشش دەکەن، کەواتە: بازاڕسازی بە شێوەی تۆڕ "ڕایەڵە" چییە؟

**بازاڕ سازی بە شێوەی ڕایەڵە:**

بریتییە لە: فرۆشتن بە شێوەی ڕاستەوخۆ، شێوازێکە جێگرەوەی شێوازە کلاسیکییەکەیە؛ چونکە لە برەوپێدانی بەرهەمی کۆمپانیاکەدا، لە بری ڕاگەیاندنو بانگەشەکردن، پشت بە بەکاربەر دەبەستێت.

هەندێ کۆمپانیا، وەک بەشێک لە ستراتیژیی بازاڕسازیی کار، بازاڕسازیی بە شێوەی تۆڕ دەکات.. بەمەبەستی بڵاوبوونەوەی پشت بە بەهێزی بەرهەمەکانی کۆمپانیاکە دەبەستێتو لە ڕێگای بانگەشەی زارەکییەوە (Word of Mouth) برەو بە بەرهەمەکانی دەدات.

**چۆنو بە چ شێوەیەک، دەست بە کاری بازاڕسازی بە شێوەی تۆڕ بکرێت؟**

سەرەتا بپرسە؛ جیاوازی چییە لە نێوان بازاڕسازی بە شێوەی ڕایەڵەو بازاڕسازی بە شێوازی کلاسیکی (بازاڕسازی ئاستە جیاوازەکان) «واتە: شۆڕبوونەوەی بەرهەم، لە خاوەن بەرهەمەوە بۆ بازرگانی کۆفرۆشو پاشان بازرگانی وردەو دواتر بۆ بەکاربەر». وەڵامەکەی جیاوازییەک نییە؛ چونکە کەسانێک، ماوەیەکی دوورو درێژ، بە شێوازی کلاسیکی لە بازاڕدا کاریان کردووەو کاریان مەیسەر بووە، بەڵام لەگەڵ بچووکبوونەوەی قەبارەی کۆمپانیاکانو بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا، لە بواری بەرهەم

هێناداو کەمبوونەوەی هەلی کارو ئاسایشی کار، خەڵکانێکی زۆر، وەك هیوایەك چاویان لەم شێوازەی کارکردن بڕی؛ چونکە لە بنیاتنانی پرۆژەی تایبەتدا، تێچوونی کەمەو مەودایەکی فراوان لەخۆ دەگرێت.

بزانە لە بازاڕسازی بە شێوەی تۆڕو ڕایەڵەدا، تۆ دەستگێڕ نیت، بۆیە ئەم چەمکە وەلاوە دەنێین، لەم کارەدا تۆ وەك بریکارێکی تایبەت کاردەکەیت (بۆ نموونە: دابەشکاری بەرهەمێکی تایبەتیت)، بەڵام تەنها نیت، سەرەتا بە تێچوونێکی کەمو توانای خۆتەوە، تیپێکی تایبەت درووست دەکەیت، هەمووتان دەست دەکەن بە دابەشکردنی بەرهەمە تایبەتەکە، پاشان سەرۆکایەتی تیپەکەت دەکەیت.

لە کاتی فرۆشتنی هەر پارچەیەك لە بەرهەمەکەدا، دابەشکار بۆ هەر پارچەیەك، لە کۆتایی کارەکەیدا، بڕێکی زیادە (عمولە) پارە وەردەگرێت.

**مێژووی بازاڕسازی بە شێوەی ڕایەڵە:**

تەمەنی ئەم شێوازەی بازاڕسازی، نزیکەی شەست ساڵێك دەبێت، لە ساڵانی چلەکانی سەدەی ڕابردوودا، کۆمپانیای (CaliforniaVitamins) کاتێك بە ئاگاهاتەوەو تەواشای کرد؛ زۆربەی کڕیارەکانی کەسە نزیكو هاوڕێی کارمەندەکانی کۆمپانیاکە بوون، ئەو کات کۆمپانیاکە بەباشی زانی، کۆمەڵێکی گەورەی خەڵك، بانگەشە بۆ بەرهەمەکانی بکەنو برەوی پێ بدەن لە بری کۆمەڵێکی بچووك باشترە، بۆیە بڕیاری دا؛ هانی برەوپێدەرانی بەرهەمەکانی بدات، بەرانبەر کرێیەکی زیادە، لێرەو شێوازێکی نوێی بازاڕسازی لەدایکبوو.

دواتر لەساڵی (١٩٥٩) دوو لەو کەسانەی لە بازاڕسازیدا، کاریان دەکرد لە کۆمپانیای (California Vitamins) وازیان هێناو کۆمپانیایەکی تایبەتیان بە ناوی (Life Nutra) درووست کرد، لە ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیاندا، بەتەواوی پشتی بە بازاڕسازی بە شێوەی ڕایەڵە دەبەست.

بەڵام لە دەیەیی هەشتەمی سەدەی ڕابردوودا، ئەم بازرگانییە بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردو بڵاوبووەوە.

**شێوازەکانی کارکردن لە بازاڕسازی بە شێوەی ڕایەڵەدا:**

**١. یەك کەس، بریکاری سەرەکیی بەرهەمەکە دەبێت:**
هاوکات ڕێگەی پێدەدرێت، تۆڕێکی دابەشکار لە بەرهەمەکە پێك بهێنێت، واتە: سنوورێکی دیاریکراو نییە، بۆ ئەو کەسانەی بریکارە سەرەکییەکە، سەرپەرشتیان دەکات. ئەو تۆڕەش، بە بەرەی پێشەوە ئاودەبرێت.

لەم سیستەمەدا، کار بۆ ئەوە دەکرێت، کە کۆمەڵێکی زۆر دیاری بکرێت، تا بەرهەمەکەی پێ بفرۆشێت، بۆ نموونە: دە کەس، یان سەد کەس، دیاری دەکرێن. لەم سیستەمەدا، کۆمپانیاکە هێندەی چنینەوەی قازانجو دوورکەوتنەوەی زەرەری مەبەستە، هێندە فراوانکردنی کارەکەی مەبەست نییە، بزانە ئەگەر بتوانیت، باوەڕ بەکەسێك بکەیت، بەرهەمەکە بکڕێتو دواتر بیفرۆشێتەوە، ئەوکات بریکاری بەرهەمەکە، ناچار دەبێت بڕێك پارەی زیادە، بدات بە کەسەکە.

**٢. سیستەمی ڕیزکراو، یان لە قاڵبدراو (مصفوفة):** ئەم شێوازە، بەراورد بە سیستەمی پێشوو، تا ڕادەیەك ئاڵۆزە؛ چونکە بریکار، تا ڕادەیەك، پەیوەستە بە بەرەی پێشەوە (الجبهة الأمامية)، لێرەدا دەبێت کەسەکان (لەقاڵبدراوەکان) بە ئاراستەی ستوونی، هەنگاو بنێن. واتە: کەسێك ڕازی بکرێت لەسەر بنەمای عموولە، ڕایەڵەیەکی ستوونی پێك بهێنێت، ئەو کارەش پاش فرۆشتنی چەند یەکەیەك لەبەرهەمەکە، درووست دەبێت.

**٣. شێوازی جیاکردنەوە:** لەم شێوازەدا، بریکار هەڵدەستێت بە فرۆشتنی بەرهەمەکە، بە کۆمەڵێکی زۆری خەڵك دواتر قەناعەتیان پێدەکات، بەرهەمەکە بفرۆشنەوەو بڕێك پارەی زیادە، بەرانبەر فرۆشتنی هەریەکەیەکی بەرهەمەکەو بوون بە ئەندام لە تۆڕی بازاڕسازییەکەدا وەربگرن. کاتێك ڕادەی فرۆشتنی بەرهەمەکە، دەگات بە ئاستێكو کەسەکان، ژمارەیان دەگات بە ژمارەیەکی دیاریکراوو لە یەکتر جیادەبنەوەو بەرانبەر کارو کۆششەکەیان، عموولەش وەرناگرن، بەڵام بەرانبەر ئەو کارە، پاداشتی کۆتایان پێدەبرێت.

بێجگە لەو شێوازانەی باسکران، شێوازی دوانەو شێوازی ئاڵۆزیش، لە بواری بازاڕسازیی تۆڕدا کاری پێدەکرێت.

**تایبەتمەندیو سوودەکانی بازاڕسازی بە شێوەی ڕایەڵە:**

ئەم شێوازە، تایبەتمەندیو سوودی زۆرە لە وانە:

١. شێوازێکی جوانە؛ بۆ ناسینی خەڵكو درووستکردنی پەیوەندیو هاوڕێیەتی.
٢. دابینکردنی ئازادی لە دیاریکردنی کاتەکانی ئیشکردندا.
٣. بازاڕسازی بەم شێوەیە، ڕێگایەکی نوێیە؛ بۆ بەدەستهێنانی سەرچاوەی دووەمی داهات.
٤. ڕێگایەکی تایبەتە؛ بۆ بەدەستهێنانی بازرگانییەکی تایبەت، بەبێئەوەی داواکارییەکی نەشیاوی تێدا بێت.
٥. بەشداریکردنت لە بازاڕسازی بە شێوەی ڕایەڵەدا، تەنها پشت بە تواناکانت دەبەستێت.
٦. بازاڕسازی بە شێوەی تۆڕ هەلێکە لەبەردەم کۆمەڵگادا.
٧. بازرگانیی ئەم شێوازەی بازاڕسازی، لە بڵاوبوونەوەدا بەردەوامیدایە.

لە وڵاتانی مەکسیك، ئەمریکا، بەریتانیا، ئوسترالیاو... هتد، کۆمپانیاگەلێکی زۆر لەو بوارەدا کار دەکەن، بە تەنها لە وڵاتێکی وەك مالیزیادا، (٨٠٠) کۆمپانیا لە بواری بازاڕسازی بە شێوەی تۆڕدا کار دەکەن، هاوکات ئەمڕۆ، لە دنیادا، (٦٦) ملیۆن کەس لەو بوارەدا ئیش دەکەنو فرۆشی ساڵانەیان، زیاتر لە (١٠٠) ملیار دۆلارە.

لە کۆتاییدا، تەنها هێندە دەڵێم: ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، سەرمایەدارو خاوەن کۆمپانیاکان لە ڕێگای ئەم شێوازەوە زیاتر سوود لە توانای سەرچاوەی مرۆیی هەرێم ببیننو بەگەڕیان بخەن، بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا، بە هۆی قەیرانە جیاوازەکانەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ ڕادەی بێکاریو هەڵئاوسان لە هەرێمی کوردستاندا، ڕووی لە زیادبوونە.

# قەڵەوی Obesity

١. هۆكارەكانی قەڵەوی:

ئەو ڕاستییە تاڵەی پێویستە بیزانین ئەوەیە؛ لە جیهاندا لە سێ كەس یەكێكیان، بەدەست قەڵەوییەوە دەناڵێنێت. زۆربەی جار قەڵەوی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو برە خۆراكو وزەیەی لەشمان وەری دەگرێت، زیاترە لەوەی لەشمان، بۆ ڕاپەڕاندنی كارەكانی سەرفی دەكات. مەگەر ئەو بارانەی تر بێت، كە نەخۆشییەك لەپشت تووشبوونەوەیە بە قەڵەوی، وەك: كەمچالاكیی سایرۆیدەرژێن-Thyroid gland-، یان هەندێك كەسی تر لەشی وا هەڵكەوتووە، كە قەڵەوبێت، یان بەهۆی زیاد بەكارهێنانی ژەمەخێراو چەورەكانو خواردنەوە گازییەكان، كە دەوڵەمەندە بەشیرینیی. بەڵام هۆكاری بۆماوەییو نەخۆشییە هۆرمۆنییەكان تەنها (١٪) ی ئەو هۆكارەكانە پێك دەهێنێت، كە دەبن بە هۆی قەڵەوی.

٢. پێوانەی بارستایی لەش (Body Mass Index)(BMI):

دەدۆزرێتەوە بەدابەشكردنی بارستایی لەش بە كیلۆگرام بەسەر دووجای درێژی باڵای كەسەكە بە مەتر دووجا، مەودای ئاسایی لە نێوان (٢٠-٢٥)دایە، بە كەسێك دەوترێت قەڵەو كە پێوانەی بارستایی لەشی زیاتر بێت لە(٣٠ كگم\مەتر دووجا). بەڵام زیادەكێشی پێناسە دەكرێت بەوەی كێشی كەسەكە لە نێوان (٢٥-٣٠ كگم\مەتر دووجا)دایە.

٣. جۆرەكانی قەڵەوی(بەپێی دابەشبوونی چەوریی لە لەشدا):

* ئەوەی سكو سنگ دەگرێتەوە (بەشی سەرەوەی لەش)، واتە: ئەگەر چێوەی بازنەی ناوقەد (Waist Circumference)ی پیاو زیاتربێت لە ١٠٤ سمو هی ئافرەت زیاتربێت لە ٨٨ سم-، كە ئەمە جۆرە ترسناكەكەیە.
* ئەوەی ناوچەی سمت دەگرێتەوە- زیاتر ئافرەتان دەگرێتەوە- ئەمەیان كەمتر مەترسیدارە.

٤. مەترسییە تەندرووستییەكانی قەڵەوی:

قەڵەوی، دەبێت بە هۆی زیادكردنی ڕوودانی گەلێك نەخۆشی؛ وەك:

* نەخۆشییەكانی خوێنبەری تاجیی دڵ (coronary heart disease)، جەڵدەی دەماخ (stroke)، سستبوونی سكۆڵەی ڕاست>
* بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.
* هەندێك جۆری شێرپەنجە، وەكو: شێرپەنجەی مەمك لای ئافرەتان، دوای تەمەنی بێئومێدیو شێرپەنجەی ناوپۆشی منداڵدانو شێرپەنجەی پرۆستات لای پیاوانو شێرپەنجەی كۆڵۆنو گورچیلە.
* نەخۆشیی شەكرە: بەجۆرێك زۆربەی ئەوانەی جۆری دووەمی شەكرەیان هەیە قەڵەون.
* بەردی زراو (Gall Stones).

هەناسەگیران لەكاتی نووستندا (Obstructive Ap-nea)و بەهۆی كۆبوونەوەی چەورییەوە لەسەر دیواری سنگو سك، هاتووچۆی هەوا بۆ ناوەوەو دەرەوەی سییەكان زەحمەت دەبێتو بەمەش ئاڵوگۆڕی ئۆكسجینو دوانۆكسیدی كاربۆن سەركەوتوو نابێت، بۆیە بە ماندووبوونێكی كەم، هەناسەی سوار دەبێت.

* دەردەمیران -گۆشت گرە- (Gout).
* هەوكردنی جومگەكانی ئێسك (Osteoarthritis).
* نەخۆشییەكانی پێست.
* لاوازیی سێكسی لای پیاوانو نەزۆكی.
* زوو ماندووبوون، كێشەی دەروونیو كۆمەڵایەتی.
* بەرزبوونەوەی چەوریی خوێن.
* كێشی زیاتر.. بیركردنەوەی خاوتر: بەجۆرێك، تاكو كێش زیاتر بێت، توانا مێشكییەكان دادەبەزن، بیركردنەوە لاواز دەبێت.

٥. ئامۆژگاریی بۆ تووشبووانی قەڵەوی:

* زۆربەی بارەكانی قەڵەوی، هۆكاری زۆر خۆراكدانی دایكانە بە منداڵان؛ لە ساڵانی سەرەتادا، بەمەش خانە چەورییەكانی لەش، گەورە دەبنو بەردەوام دەبن لەزیادكردنو گەورەبوون.. بۆیە پێویستە دایكان لەمنداڵییەوە، خۆراكی تەندرووستو كەمچەوری بدەنە منداڵەكانیان.
* باشترین ڕێگەی كێش دابەزاندن، دابەزاندنی هێواش هێواشە.
* بۆ تواندنەوەی چەوری، باشترین ڕێگا وەرزشكردنە، بەتایبەت خێراڕۆیشتنو پشتنەبەستن بە ئۆتۆمبێل.



* ئەو خۆراكانەی پێیان دەوترێت: (خۆراكی ڕێجیم) سوودی نییەو بێكەڵكە.
* دەرمانی دابەزاندنی كێش، سوودی كەمەو زیانی زۆرە.
* كەمتر بخۆ لەوەی كە دەیخۆیت: بەتایبەت شیرینیو چەوریو سووركراوەو زیاتر میوە بخۆ.
* تەنها چاودێریكردنی خۆراك بەس نییە، بەڵكو پێویستە چاودێریی خواردنەوە پڕ لە شەكرەكانی وەك خواردنەوە گازییەكانیش بكرێت.
*دوور بكەوەرەوە لە خۆراكی چەور: وەك گۆشتی چەور، ئەو شیرەمەنییانەی چەورییان زۆرە وەك: پەنیر، كەرەو كرێم.
* هەوڵ بدە ئەو شیرەمەنییانە بخۆ، كە چەورییان كەمەو چەورییە ناتێرەكان بەكار بهێنە، وەك: زەیتی گوڵەبەڕۆژە، زەیتی گەنمەشامیو زەیتی زەیتوون لە جیاتی ڕۆنی بەستوو.

ن: د.حسان شمسی پاشا --------و: یەحیا محەممەد عەلی



# کیوی و سوودەکانی

ئەم میوەیە، چەندین کانزای بەسوودو ڤیتامینو دژەئۆکسانی تێدایە، ڕێژەی ڤیتامین (C) لە کیویدا، زیاترە بەراورد بە پرتەقاڵ، ڕێژەی پۆتاسیۆم تێیدا زۆرترە؛ وەك ڕێژەکەی لە مۆزدا، هەروەها کیوی، دەوڵەمەندە بە ڤیتامین (E)، هەربۆیە کیوی بە میوەیەکی بەسوود بۆ تەندرووستی لەشو پاراستنی لە نەخۆشی دادەنرێت، سەرەڕای ئەوەش بڕێك ڕیشاڵی تێدایە، کە بەئاسانی لە ڕیخۆڵەکاندا هەرس دەبێت، ئاستی کۆلیسترۆڵی خوێنیش، نزم دەکاتەوە، هەروەها دەوڵەمەندە بە ترشی لینۆلیك ئەویش یەکێکە لە ترشەکانی ئۆمیگا سێ.

ئەم میوەیە، لە زۆربەی شارەکانی جیهاندا هەیە، بەتایبەتی ئیتاڵیاو نیوزلەنداو بەڕازیلو چیلیو چینو ئەمریکاو یۆنانو فەڕەنسا، بەڵام چین بە یەکەم سەرچاوەی سەرهەڵدانی کیوی دادەنرێتو لە ئێستادا زۆرترینو گەورەترین بەرهەمهێنەری کیوییە لە جیهاندا.

### سوودەکانی:

### یەکەم: سوودی کیوی بۆ پێست

کیوی زۆرترین ڕێژەی ڤیتامین (C) تێدایە، ئەو ڤیتامینەش بەوە ناسراوە، پێست لە شێرپەنجە دەپارێزێت، هەروەها پێست بە شێداری دەهێڵێتەوەو خاڵە ڕەشەکان لا دەباتو چرچولۆچیی دەموچاو دوا دەخات، هەروەها سوودی هەیە لە نەهێشتنی ژەهر لە پێستدا، لەبەرئەوەی وەك کارای دژە ئۆکسانێکی بەهێز کاردەکات، بەکارهێنانی کیوی، تەنها خواردنی بەسوود نییە، بەڵکو بە دانانی لەسەر پێستەکەش، سوودی هەیە.

### دووەم: سوودی بۆ ئافرەتی دووگیان:

کیوی بەهۆی زۆریی بڕی ڤیتامینو کانزاوە، بە میوەیەکی نموونەیی بۆ ئافرەتی دووگیان دادەنرێت؛ بۆ گەشەی منداڵ لە قۆناغە جیاوازەکانی دووگیانیدا، هەروەها بوونی ڕیشاڵ تێیدا، بەشێوەیەکی زۆر، ژنانی دووگیان لە قەبزی دەپارێزێت، کە زۆربەیان دوچاری دەبن.. ئەو ڕیشاڵانەش یارمەتی زوو هەرسکردنی دەداتو لە تووشبوون بە مایەسیری دەیپارێزێت، سەرەڕای بوونی دژە ئۆکسانەکان تێیدا، یارمەتیی چاکبوونەوەی شانەی لەشی زیانلێکەوتوو لەماوەی دووگیانیدا دەدات. هەروەها یارمەتیی لەش دەدات؛ بۆ مژینی ئاسن، بەهۆی ڤیتامین (C)یەوە.

### سێیەم: زۆری ئاستەکانی دژە ئۆکسانەکان لە کیویدا:

سوودی بۆ قژ زۆرە، چونکە تاڵە مووەکان لە مووخورکە دەپارێزێتو ڕێگری لە زوو دەرکەوتنی تاڵەمووی سپی دەکات، لە کاتێکدا ڕەنگی قژ، پەیوەندی بە ماددەی میلانینەوە هەیە، ئەویش بەهۆی ترشی فینیل ئەنینەوە درووست دەبێت.

### چوارەم: سوودی کیوی بۆ منداڵ:

لێکۆڵینەوەیەك لە ئیتاڵیا، لەسەر ئەو منداڵانەی کێشەی هەناسەو کۆکینیان هەیە، لە کاتی خەودا کرا، بە خواردنی کیوی؛ حەوت جار لە هەفتەیەکدا، ئەو نیشانانە دیار نەمان، بەتایبەتی ئەوانە سوودمەند بوون، کە بە دەست کێشەی ڕەبوو دەناڵێنن. هۆکاری ئەمەش، بۆ بوونی ڤیتامین (C)و پۆتاسیۆمو فلافونویدات دەگەڕێتەوە، کە یارمەتیی پاراستنی خانەکان دەدات لە ئۆکسان، بەڵام بۆ منداڵی شیرەخۆرە، کە تەمەنی کەمترە لە ١٠ -١٢ مانگ خواردنی باش نییە، چونکە میوەیەکی ترشە.

### پێنجەم: سوودی کیوی بۆ کۆڵۆن:

وەك پێشتر، ئاماژەمان بە بوونی ڕیشاڵی زۆر کرد، لەناو کیویدا، کە یارمەتیدەرە بۆ هەرسکردن بەباشیو ئاسان فڕێدانەوەی پاشەڕۆو پاراستنی لە قەبزبوون، ئەوەش مرۆڤ، لە شێرپەنجەی کۆڵۆن دەپارێزێت.. توێکڵەکەشی بڕێکی زۆر ڕیشاڵی تێدایەو بۆ خواردنیش دەست دەدات.

زانایانی نیوزلەندا، ئەوەیان دەرخستووە، کە خواردنی کیوی، لەگەڵ ژەمێکی دەوڵەمەند بە پرۆتینی ئاژەڵیدا، یارمەتی باش هەرسکردنی پرۆتینەکە دەدات، د. مایك بۆلاند؛ سەرۆکی تیمی لێکۆڵینەوەکە، ئاماژە دەکات بەوەی کیوی، هەرسکردنی گۆشت زیاد دەکات؛ بەهۆی بوونی ئەنزیمی ئەکتیدینین، کە توانای تێکشکاندنی پرۆتینی گۆشتەکەی هەیە، کیوی تاکە میوەیە، کە ئەو ئەنزیمەی تێدا بێت!

سەرەڕای باشیو بەسوودی کیوی، بەڵام زۆر خواردنی دەبێتە هۆی سکچوون، یان درووستبوونی هەستیاری، هەروەها ئامۆژگاری ئەو کەسانەی کێشەی گورچیلەیان هەیە دەکرێت، کە نەیخۆن؛ چونکە دەبێت بە هۆی درووستبوونی بەرد لە گورچیلەداو بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە ئۆکسالات. سەرچاوە: سایتی فوائد



# لێکدانەوەی کەسایەتیت،

## بەپێی مانگی لەدایکبوونت..

## "مانگی سێ"

لە ژمارەی ڕابوردوودا، باسمان لە تایبەتمەندییەکانی ئەو کەسانە کرد، کە لە مانگی دوودا چاویان بە دنیا هەڵهێناوە، لەم ژمارەیەدا، باس لە تایبەتمەندییەکانی ئەو کەسانە دەکەین، کە لە مانگی سێدا، هاتوونەتە نێو سەراسیمای ژیانی ئەم دونیایەوە... بێگومان هەڵسەنگاندنو لێکدانەوەی کەسایەتییەکان بەپێی مانگی لەدایکبوون، لە خۆڕا نەهاتووە، بەڵکو توێژینەوە بۆ چەندین کەس ئەنجام دراوە، کە لە هەر یەك لە مانگەکاندا لە دایکبوون، دواتر دەروونناسان گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە بە شێوەیەکی گشتی، هەر مانگێك کۆمەڵێك خاسییەتو سیفاتی هەیە، کە لەوی دیکە جیاوازە، واتە: هەر مانگێك تایبەتمەندیی خۆی هەیە.. هەڵبەت ئەم سیفەتانە، مانای وانییە، کە مرۆڤەکان ناتوانن دەستبەرداری سیفەتە خراپەکانی ئەو مانگانە بن، کە تێیدا لە دایکبوون، بەپێچەوانەوە، ئێمە لەبەرئەوە سیفەتە نەرێنیو ئەرێنییەکان بۆ بەڕێزتان باس دەکەین، بۆئەوەی هەوڵ بدەن گەشەی زیاتر بە سیفەتە ئەرێنییەکان بدەنو خۆتان لە سیفەتە خراپەکانی ئەو مانگە دوور بخەنەوە.. چونکە هەندێجار مرۆڤ، هەست بە سیفەتی ئەرێنیی خۆی ناکات، بەڵام کاتێك سیفەتەکانی بۆ ڕوون دەکرێتەوە، هەست دەکات ئەو سیفەتە، لە ئەویشدا بوونی هەیە، لەبەرئەوە ژیرانە هەوڵی گۆڕینی دەدات..

**لایەنە ئەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی (٣)دا چاویان بە دونیا هەڵهێناوە:**

١- خاوەنی کەسایەتییەکی سەرنجڕاکێشە.

٢- بەسۆزو میهرەبانە.

٣- شەرمنو پارێزکارە.

٤- کەسێکی بەخشندەیەو بە فیترەت ئەمینو دەستپاکە.

٥- کەسێکی ئاشتیخوازەو ئارامو لەسەرخۆیە.

٦- حەز دەکات خزمەتی هاوڕێو کەسانی دەوروبەری بکات.

٧- بەئاسانی تووڕە نابێت. واتە: پشوو درێژو لەسەر خۆیە.

٨- لە متمانەبەخشیندا بەتوانایە.

٩- بە توانایەو حەزدەکات وەڵامو پەرچەکردارەکانی جوان بن.

١٠- لە سەرنجداندا کەسێکی بەهێزەو حەز بە هەڵسەنگاندنی کەسانی دەوروبەری دەکات.

١١- کەسێکی ڕۆحسووکو خوێنشیرینە، حەز بە خەوبینینو خەیاڵکردن دەکاتو خاوەنی هیواو ئاواتە.

١٢- حەز بە گەشتکردنو سەیرانو چوونە دەرەوە دەکات.

١٣- چێژ لە جوانکاریو خۆڕازاندنەوەو گۆڕینی دیکۆراتی ماڵ دەبینێت.

١٤- خاوەنی مەوهیبەیە.

١٥- حەز دەکات شتە تایبەتەکانی بگرێتە خۆی.

**سیفەتە نرێنییەکانی:-**

١- تۆڵەستێنە، واتە: زیاتر حەز بە تۆڵەسەندن دەکات، لە بری لێبوردن.

٢- کەسێکی مەزاجییە.

٣- بەرامبەر کەسانی دیکە هەستیارە.

# بەهای زانستو زانین



**زاهیر زانا**

زانست چرای دەستی مرۆڤە؛ بۆ ڕووناککردنەوەی ڕێگاکانو نەشتەری چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانو کلیلی کردنەوەی دەرگا داخراوەکانو شەمەندەفەری گەیەنەرمانە؛ بە ئاواتو ئامانجو مەبەستەکانو فریادڕەسو چاوساغمانە؛ بۆ باخچەی بەختەوەری.. زانست، خشڵی ڕازاندنەوەیەو بەنرخترین دراوو سەرمایەیە، زانست چاوی ڕاستەقینەی مرۆڤەو قاچو توانای ڕۆشتنییەتی بۆ داهاتوو، پێشکەوتنو هۆکاری شارستانییەتو گەشەسەندنو داهێنانەو دەرمانە بۆ دەردەکان.

زانستو زانین، پارێزەرمانن لە کەوتنو دەستگیرمانن بۆ هەستانەوەو سەرکەوتن، بۆیە هەرچەندە بەدوای زانستو زانیاریدا وێڵ بینو زیاتر بزانین، باشترەو گەورەیی هەر کەسێکیش، بەندە بە ئەو زانستەی کە هەیەتی، زانست بەجۆرێك بەنرخو قەدرە، زۆرجار منداڵێك پێش کەسێکی بەتەمەن دەخات، تەنانەت (سەگی فێرکراو) نێچیرێك، کە بیگرێت، پاکەو دەخورێت، بەفەزڵی ئەو زانینەی کە هەیەتی، گۆڕیویەتی بۆ پلەیەکی بەرزتر. ئەزیزانم، بێگومان لە مێژوودا، سەرمایەدارو دەوڵەمەندو خاوەن کۆشکو تەلارەکان، زۆر بوون.. بەڵام ئەوان ناویان نەماوە، ئەوە فەیلەسوفو زاناکانن، هەتا ئێستاش، ناویان زیندووەو لەگەڵماندا دەژین، کێ هەیە قەرزاری ئەدیسۆن نەبێو لەبەر ڕووناکیی گڵۆپدا دانەنیشتبێ، ئەوەتا ئیمامی عەلی دەڵێت: (زانست لە سامان باشترە؛ زانست دەتپارێزێ، سەرمایە دەبێت بیپارێزی، زانست فەرمانڕەوایەو سەرمایە فەرمانپێکراوە، زانست بە بەخشین زیاد دەکات، سەرمایە بەبەخشین کەم دەکات).

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، کار لەسەر خۆمان بکەینو کاتەکانمان بەبەتاڵی نەسووتێنینو لە فێربوونو خزمەتی زانستدا خەرجی بکەین، بۆئەوەی ژیانمان مانایەکی جوانتری هەبێتو بەنرخترین سەرمایە کە زانستو زانیارییە، کۆ بکەینەوە، بەدەستهێنانی زانستو زانیاری، پەیوەست نییە بە تەمەنەوە، دەبێت لە هەموو قۆناغێکدا بەدوای بەدەستهێنانی زانیاریدابین، چونکە قۆناغێك نییە، بڵێین ئێمە هەموو شتێك دەزانین، بگرە هەرچەندە زاناتربین، بۆمان دەردەکەوێت؛ هێشتا زۆرمان ماوە بزانینو خۆمان بەنەزان دەزانینو خاکیتر دەبینو هەوڵی بەخشین دەدەین؛ لەوەی دەیزانین.. ئەوەتا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەفەرموێت: (یا فێرکاربە، یا فێرخواز؛ ئەگینا لەناو دەچیت). هەموومان چیرۆکی موسا پێغەمبەرمان بیستوە (سەلامی خوای لێ بێ) کاتێك لێی دەپرسن: کەس لە تۆ زاناتر هەیە؟ دەڵێت: نەخێر، پاشان خوای گەورە، پێی دەفەرموێت: کەسێك لە تۆ زاناتر هەیەو لە فلان شوێنە، بۆیە موسا سەدان کیلۆمەتر دەبڕێت، تا دەگاتە لای ئەو زانایەو بەئەدەبێکی بەرزەوە، داوای لێدەکات فێری بکات، زاناکان سەرچاوەی ڕووناکین بۆ دەوروبەرو جیاوازی زانا لەگەڵ کەسانی تردا، وەك مانگو ئەستێرەکانەو وەك ڕووناکیو تاریکی وایە، ئیمامی ئەحمەدیش دەفەرموێت: (پێویستیی خەڵك بەزانین، لە پێویستییان بۆ خواردن زیاترە، چونکە ڕۆژی دووجار خواردنمان دەوێت، بەڵام بەقەد ژمارەی هەناسەکانمان، پێویستمان بە زانینە. بۆیە شتێکمان بەقەدرتر لە زانستو زانیاری دەست ناکەوێت، تەمەنی خۆمانی لە پێناودا سەرف بکەین؛ چونکە ناتوانین هیچ هەنگاوێك، بەبێ زانست هەڵبگرینو ئەگەر هەڵیشمان گرت، ئەوا بڕوا مەکەن؛ ئامانج بپێکین، بۆیە پێویستە بڵێین:

(وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا).



## مۆمی ٣١

## ٥٠ مۆم بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەتان

# مەزنترین هونەر!

مێشک، لە دوای ئیمان، مەزنترین بەخششەکانی خودایە، کە بە ئادەمیزادی بەخشیوە، بەڵام بەشێوازە ڕاستەکەی، سوودی لێ نابینن، زۆرێک لە توێژینەوەکان، لە ڕۆژنامە جیاوازەکاندا، ئاماژە بەوە دەکەن، کە مێشکی مرۆڤ، بێجگە لە (١٪)ی توانای ڕاستەقینەی خۆی، زیاتری بەکارنەهێناوە. هەر لەمەشەوە دەتوانین بڵێین: هونەری بیرکردنەوە، ناوازەترینو بەرزترینی هونەرەکانە، لەلای مرۆڤایەتی؛ چونکە لە سایەیدا، ئاڕاستەمان دیاری دەکەین، تازەگەریو داهێنان دەکەین، عەیبو لایەنی کەموکورتیمان دیاری دەکەین ... زۆر بەداخەوە، کچو کوڕەکانم، بیرکردنەوەیەکی بەرهەمدارانە ئەنجام نادەین.. تەنها لە کاتی پێویستیدا نەبێت، ئەگەر مەشقیشی لەسەر بکەین، زۆر بە کەمی خۆمانی لەگەڵدا ماندوو دەکەین؛ ئەمەش بەهۆی قورساییەکەیەتی، هەروەها بە هۆی ڕانەهێنانمان لە منداڵیدا. من لێرەدا، ناتوانم زۆر لەسەر (هونەری بیرکردنەوە) بۆتان بدوێم، بەڵام بە ویستی خودای گەورە، چەند تێبینییەکی گرنگو بەسوودتان بۆ دەخەمەڕوو، لەو لایەنانەی کە پەیوەستە بە بیرکردنەوەوە:

١. مێشکمان کار لەسەر ئەو زانیارییانە دەکات، کە هەمانە، ئەگەر تازەو باوەڕپێکراو بن، لە ئەنجامدا بڕیارو پێشبینیو ڕاکانمان ڕاست دەبن، یاخود نزیک دەبن لە ڕاستی، بەڵام لەهەمان کاتدا، ئەگەر شێواوو ناڕاست بن، ئەنجامی بیرکردنەوەکانمان زیاتر هەڵە دەبێت، ڕێک وەک ئەوەی پێت بوترێت، خوێندن لە فڵان زانکۆ زۆر ئاسانە، تۆیش بیر لە خۆت دەکەیتەوەو ڕێڕەوی داهاتووت دیاری دەکەیت، هەر لەسەر ئەو بنەمایەش، خۆت ناونووس دەکەیت، بەڵام دواتر بۆت ڕوون دەبێتەوە، کە زۆر قورسەو لە کاتی خوێندندا، ناتوانیت هیچ کارێکی تر بکەیت، گومانی تێدا نییە، سەرت دەسوڕمێتو تووشی شکست دەبیت، پشێوی دەکەوێتە ناو هەموو پلانەکانتەوە، هەر بۆیەش قورئانی پیرۆز، زۆر جەخت دەکاتەوە؛ لەسەر بابەتی ڕاستگۆییو سپاردەپارێزی لە گەیاندنی هەواڵدا، هەروەها ئاماژەش بە ڕوونی دەکات لە دەربڕینی ڕاستییەکاندا.

هەمیشە هەوڵ بدەن؛ لە سنووری ڕاستیدا بیر لەوانە بکەنەوە، کە دەیخوێننەوە، یان دەیبیستن پێش ئەوەی ڕێگەی پێ بدەن تەشەنە بکاتە ناو مێشکتان، ئێوە زۆر دەبیستنو لەبەر دەکەن، بەڵام ئاگاداربن ئێمە نامانەوێت ئەقڵتان لە ئەقڵێکی خاڵی لە زانیارییەوە بگۆڕێت، بۆ ئەقڵێکی پڕ لە زانیاری، بەڵکو دەمانەوێت؛ بگۆڕێت بە ئەقڵێکی کراوە، کە توانای تێبینیکردنو شیکردنەوەو ڕەخنەگرتنی هەبێتو درک بە پەیوەندییەکان بکاتو شتەکان پێکەوە ببەستێت، ئەمەش کچو کوڕەکانم؛ لەڕێگەی بایەخ پێدانو پرسیاری زیرەکانەوە دەبێت: بۆچی فڵانە کەسی هاوڕێم، هەمیشە بەختەوەرە؛ سەرەڕای ئەوەی کە زۆر هەژاریشە؟ نموونەترین شێواز کامەیە، کە من دەتوانم پشتی پێ ببەستم؛ بۆ سوودبینین لە مامۆستاکانم؟ ئەو کارە پێشەنگانە کامانەن، کە دەبێت لەماوەی ئەم مانگەدا، بایەخی پێبدەم؟ چۆن دەتوانم؛ دڵی دایکم خۆش بکەمو ڕەزامەند بێت؛ سەرەڕای ئەو ئازارە زۆرەی دەیچێژێت، بەهۆی لەدەستدانی براکەم؟ ....

٢. کاتێک یەکێکتان دەیەوێت؛ بۆ کارێک دەستپێشخەری بکات، بۆ نموونە: بڕیاردان لەسەر هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی دیاریکراودا، یاخود دیاریکردنی پسپۆڕییەکەت لە زانکۆدا... دەبێت بەپەلە، پرۆسەی (ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا) ئەنجام بدات، یاخود بە هاوکاریی چەند هاوپۆلێک، ئەوە شی بکەرەوە، کە دەتەوێت؛ بڕیاری لەسەر بدەیت، کە ئەمەیان باشترە، خاسیەتەکانی ئەو پسپۆڕییە چین؟ ئایا من شایستەی خوێندنم تێیدا؟ ئایا هەلی کارکردنم دەبێت لە دوای تەواوکردنی؟ ئەو ڕێگرانە چین، کە دەکرێت بێنە سەر ڕێگەم، لە کاتی خوێندنەکەمدا؟ هەر بەڕاستی ئەمە شیاوترینو باشترین پسپۆڕییە، کە هەوڵ دەدەم تێیدا بخوێنم؟ ئیدی بەم شێوەیە .... ڕاستیش نییە؛ ڕەخنە لە هیچ یەکێک لەو بیروڕایانە بگیرێت، کە دەردەبڕدرێت، لەو پرۆسەیەداو هەموو بیرۆکەکان قبوڵکراونو جێگەی دەستخۆشین، چەندێک بێماناش بن، لە کۆتاییدا پیاچوونەوە بۆ هەموو ئەوانە دەکرێت، کە ئاماژەیان پێکراوە بۆ جیاکردنەوەو لابردنی بیرۆکە لاوازو بێجێکان.

٣. لە ژیانی هەر یەکێکتاندا، چەندان پرسی چارەنووسسازو مەزن هەیە، پێویستی بە بڕیاردانێکی گرنگو یەکلاکەرەوە هەیە، ئێوەش دەبێت مافی خۆی پێ بدەن لە وردبینیو بیرکردنەوەو ڕاوێژپێکردندا.... بڕیاری مەزن، ئەو بڕیارەیە، کە کاریگەرییەکی گەورە لەسەر ژیانی خاوەنەکەیو بگرە خێزانەکەشی دروست دەکات؛ هاوشێوەی بڕیارەکانی، کە پەیوەستن بە هاوسەرگیریو خوێندنو ماڵ گواستنەوە لە گوندەوە بۆ شار، هەروەها گەشتکردن بۆ وڵاتێکی دوور، بۆ ماوەیەکی زۆر درێژو بنیاتنانی پرۆژەیەکی زۆر گەورە، کە کەسەکە هەموو سامانی خۆی تێدا دادەنێت..... لێرەدا دوو شتی ترسناکمان هەیە، ئەوانیش پەلەکردنو کەمتەرخەمییە، بە مانایەکی تر کۆشش نەکردنێکی تەواو، پێش دانی بڕیارەکە.

٤. لە بیرکردنەوەتاندا ژیریی و بەڵگەی ڕوونو ئەزموونو ڕاستییە هاوشێوەکان لە ژیانتاندا بەکاربهێنن، هەروەها هەستو نەستتان بەکاربهێنن- ئەو هێزە شاراوەیەی، کە ناخی ئێمەی بەدەستە- گەلێک نهێنی لایە، بۆئەوەی پێتان بڵێت، وەک پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) دەفەرموێت: "چاکە ئەوەیە، دەروون پێی ئارام دەبێتو دڵ پێی ئاسوودە دەبێت، تاوان دەروون دەهێنێتە لەرزەو دوودڵیت لەبەرامبەریدا".

٥. بیر لەوە بکەنەوە، کە دەیخوێننەوە، هەوڵی گفتوگۆ بدەن لەگەڵ نووسەردا لەسەر هەندێک لەوەی نووسیویەتی، نووسەریش لە کۆتاییدا مرۆڤە؛ دەکەوێتو هەڵە دەکات، ڕەنگە بەدووی هەوەسی بکەوێت، کوڕی زیرەکو کچی سەنگین دەزانن چۆن بابەتەکانی نووسەر هەڵدەسەنگێننو ئەقڵو هۆشیان بەتەواوی نادەن بە دەست نووسەرو لەهەمانکاتیشدا، دان دەنێن بەلایەنە باشەکانی نووسەردا.



# پاش چەند کاتژمێرێك لە مردنی، دەماغی دیار نەما

میران جەمال

سەیر لەوەدایە کەسێك پاش مردنی دەبێت چ سوودێك لە جەستەی، یان ئەندامێکی جەستەی ببینرێ، بەڵام دیارە، کە ئەو ئەندامە، یان خاوەن ئەندامەکە کەسێك بووە شایەنی لێکۆڵینەوە بووە، تەنانەت پاش مردنیشی.

ئەلبێرت ئەنشتاین، یەکێکە لە زانا گەورەکانی فیزیاو بە گەورەترین زانای سەدەی بیستەم دادەنرێت. ئەنشتاینی خاوەن بیردۆزەی ڕێژەیی، بەدەر لەم بیردۆزە کاریگەرە، خاوەنی چەندەها قسەو وتەی جوانو بەهێزو داهێنانی فیزیاییو ئەندازیاریو ژمارەو ...هتد.

هەروەها خاوەنی یەکێك لە هەرە هاوکێشە گرنگەکانی، کە تا ئێستا بەکاردەهێنرێو بایەخی زۆری پێدەدرێ ئەویش:

(وزە= بارستایی کەرەتی خێرایی ڕووناکی دوجا)!

ئەنیشتاین لە ساڵی ١٩٢١دا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە لە فیزیادا، لە کاتی دروستبونی دەوڵەتی ئیسرائیلدا، پێشنیاری ئەوەیان بۆ کردووە، کە بیکەن بە سەرۆکی ئەو دەوڵەتە، بەڵام ڕازی نەبووە ئەو پۆستە وەربگرێت، بەدەر لەوەش چەندەها پۆستی سیاسی دیکەشی ڕەت کردۆتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەنشتاین حەزی بە زانستو داهێنان بووە، نەك سیاسەتو بەڕێوەبردن.

ئەنشتاین تاکو دوا چرکە ساتەکانی ژیانی تیانووسو پێنووسەکەی بەدەستەوە بوو، کە بە زمانی دایك، واتە: زمانی ئەڵمانی تێبینی نووسیوە، تا لە دوا هەناسەکانیشیدا تیانووسەکەی لەسەر سنگی بووە.

ئەنیشتاین لە ژیانیدا قەدری کاتی زۆر زانیوە، زۆربەی داهێنانەکانی ئەنشتاین بۆ بیرکردنەوەکانی دەگەڕێتەوە، لە کاتە بەتاڵەکانیدا خۆی بە بیرکردنەوەو تێڕامانو سەرنجدانەوە سەرقاڵ کردووە، دوای ئەوەی لە تەمەنی ٧٦ ساڵیداو لە ساڵی ١٩٥٥ لە نەخۆشخانەی پریستۆن لە نیوجێرسی لە ئەمەریکا گیان لەدەست دەداتو چەند کاژمێرێك دوای مردنی، فایلی ڕەسمی توێکاریکردنەکەی(تشریح)و دەماغی ئەلبێرت ئەنیشتاین دیار نامێنێ، دواتر زانرا، کە ئەو کەسەی تاوانبارە بە ونکردنی دەماغەکە (د. تۆماس هارڤی)ە، لە کاتی توێکاریکردنی بۆ جەستەی ئەنشتاین، دەماغی ئەنشتاین بۆخۆی دەباتو پاشان چەندین لێکۆڵینەوەو شیکاری لەسەر دەکات.

دوای بردنی ئەم دەماغە، دەیکات بە ٢٤٠ پارچەوەو چەند پارچەیەك لەو دەمارە خانانە دەبەخشێتە ئەو زانایانەی بە هەمان شێوە تامەزرۆی بینینی دەماغی ئەنشتاین بوونو ویستویانە لێی بکۆڵنەوەو شیکاری بۆ بکەن، هەندێك لە لێکۆڵەرەوان هۆکاری لێهاتویی (عەبقەرێتی) ئەنیشتاین بۆ کێشی دەماغی ئەنشتاین دەگێڕنەوە، کە ١.٢٥کگم بووە. هەندێکی تر پێیان وایە، کە هۆکاری لێهاتووییەکەی دەمارە خانەکانی دەماغی بووە.

هەندێکی تریش بۆ توانای بیرکردنەوەی ئەنشتاین خۆی دەگێڕنەوە، کە مەودای بیرکردنەوەی گەلێك دوور بووە هەر وەکو خۆی دەڵێت: (خەیاڵ لە مەعریفە گەورەترە).

# وەڵامی بەجێ



* هەنگوینفرۆشێك، لە سركەفرۆشێك دەپرسێت: ئەوە بۆچی خەڵكی بەلێشاو، دێن بۆ لای تۆو سركەی تفتوتاڵت لێ دەكڕن، كەچی ڕوو لە من ناكەن، لە كاتێكدا من هەنگوینی خۆشو شیرینم لایە؟! سركەفرۆشەكە گوتی: من، بە زمانی خۆشو شیرینی هەنگوینی، سركە دەفرۆشم.. تۆش، بە زمانی تفتو تاڵی سركەیی، هەنگوین دەفرۆشیت!



* پیاوماقوڵانی بەصرە، بڕیاریان دا كۆشكێك بنیات بنێن، لە تەنیشتی ئەو زەوییەوە، كە بڕیار بوو كۆشكەكە بنیات بنێن، ماڵی پیرەژنێكی لێ بوو، كە دەبوایە؛ ئەو زەوییە بۆ فراوانكردنی تەلارەكەیان بكڕن، بۆ ئەم مەبەستە، پیاوماقوڵان ڕۆیشتن بۆ لای پیرەژنەكە، بەڵام پیرەژن ڕازی نەبوو، خانووەكەی بفرۆشێت، هەرچەندە خانووی پیرەژنەكە ٢٠ دیناری ئەو كاتەی دەكرد، ئەوان بۆیان كرد بە ٢٠٠ دینار، دووبارە پیرەژن ڕازی نەبوو.. پێیان وت: دەڕۆین بۆ لای قازی، تا فەرمان دبكات، خانووەكەت دەستی بەسەردا بگیرێت، بە پاساوی ئەوەی تۆ ٢٠٠ دینار ناگۆڕیتەوە بە بیست دینار، كەواتە: تۆ كەسێكی شێتو نەزانو گێلیت!

پیرەژنەكە گوتی: ئەی كەواتە: بۆچی قازی فەرمانی شێتیو نەزانیو گێلی بۆ كەسانێك دەرناكات، كە ماڵێك بەهاكەی ٢٠ دینارە، ئەوان ٢٠٠ دیناری پێ دەدەن!؟

هەمووانی بەم وەڵامە بێدەنگ كردو لێیاندا ڕۆیشتن!



* لە "چەرچڵ"ی سەرۆكوەزیرانی بەریتانیایان پرسی: ئێوە وەك بەریتانییەكان، تا ئەو سەری زەریای هیندی دەڕۆنو دەوڵەتی ئیستعماریی ڕۆژهەڵاتی هیند دروست دەكەن.. ئەی بۆچی ناتوانن ئێرلەندای باكوور، كە لە پاڵ دەستاندایە، بخەنە ژێر ڕكێفی خۆتانەوە؟

چەرچڵ گوتی: ئێمە دوو هۆكاری گرنگمان پێویستە، كە لە ئێرلەندەدا دەستمان ناكەوێت.

پرسییان ئەو دوو هۆكارە چین؟

چەرچڵ گوتی: زۆرینەی نەزانو كەمینەی خائین!

# گۆرانی بڵێ بۆ ژیان

* یەکەم ڕێسا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ چاڵەکانی ژیاندا، ئەوەیە کە کاتێك خۆت لە نێو چاڵێکدا دەبینی، لە هەڵکەندنی چاڵەکە بوەستە!

مۆلی ئیفیز.. نووسەر

* دەتوانیت بەلاکە سووك بکەیت، بەوەی خەوێکی باش بکەیتو پاشان، خۆشۆرینێکی خۆش.

تۆماس ئەکیناس.. فەیلەسوف

* ژیان سەختە، بەلام زۆر سەختتر دەبێت، کاتێك مرۆڤ گێلانە هەڵسوکەوت دەکات..

جۆن واین.. ئەکتەر

* ئێستا کاتی ئەوە نیە؛ بیر لەو شتانە بکەیتەوە، کە لێیان مەحروومیت، بیر لەو کارانە بکەرەوە، کە دەتوانیت ئەنجامیان بدەیت، بەو شتانەی کە لەبەر دەستتدان!

هەمنگوای.. نووسەر

* ترس، تامەکەی وەك چەقۆی ژەنگاوی وایە، مەهێڵە بێتە نێو ماڵەکەت..

جۆن چیڤەر.. نووسەر

* دوور لەوەی کە ژمارەی ئەو فرمێسکانە چەندن، کە مرۆڤ دەیانڕێژێت، بەڵام لە کۆتاییدا دەیانسڕێتو بەردەوام دەبێت لە ژیاندا..

هێنریك هاینە.. نووسەر



شناویا محمد احمد

# بەخشینو وەرگرتنەوە، لە ناخی خۆتەوە دەست پێدەکات!

تێڕامانی مرۆڤ، لە مرۆڤ زۆر سەختترە، وەك لە هەر تێڕامانێکی ترو زیاتر لە هەر ئەرکێکی تر، مرۆڤ ماندوو دەکات، چونکە هەتا ئێستاش دەروونی مرۆڤ، لە ئازادییەکی ڕەهادا دەژیو هیچ سنوورێکو هیچ یاسایەك نییە، کە هەستی مرۆڤەکان، کۆنترۆڵ بکات، کە لە گەردووندا، هیچ شتێك، بە ناوی ئازادیی ڕەها، بوونی نییە، تەنانەت زانستیش، سنووردراوە بە کۆمەڵێك یاساو ناتوانن سنوورەکان تێبپەڕێنن، بۆیە کاتێك باسەکان دێنە سەر ناوەوەی مرۆڤ.. خەیاڵ، بڵاوو پەرتەوازە دەبێتو ماندووبوونێکی تەواوی لە دوایە.

هەموو شتێك، بازنەیەکی بە دەوردا کێشراوەو لە ناو ئەو بازنەیەدا دەژی، خاڵێك هەیە، لە دوای هەر بابەتێکو هەر فەلسەفەیەکو هەر سروشتێکو هەر وتەیەکو هەر دیمەنێکو ... هتد، بەڵام ئێستا، هەموو هەوڵەکانی مرۆڤ، بۆ شکاندنی ئەو بازنەیەیەو دەیەوێت هەموو سنوورەکان ببەزێنێتو تەواو ئازاد بێت، کاتێکیش ئازاد بوو، خاڵ دانانێت، بەڵکو کۆمەڵە خاڵێك بە تەواو نەکراوی دەهێڵێتەوە؛ وەك ئەوەی بەو خاڵانە، پێمان بڵێ: من هیچ کات ناوەستمو زیاترو زیاترم دەوێ، من زیاتر لە ئازادیم دەوێت!! سەرەکیترین هۆکاریش بۆ ئەمە ئەوەیە، کە مێشکی مرۆڤ، بە شێوەیەکی ڕەها، بیرناکاتەوەو مرۆڤ لە هەر چرکە ساتێکدا، شایەنی گۆڕانە، چ بە باش، یان خراپ...

ڕەجا نەققاش لە یەکێك لە نووسینە زۆر کۆنەکانیدا، باس لە چاوی مرۆڤەکان دەکات، کە چۆن سەرنجی ڕادەکێشێتو بە دەرگای چوونە ناو دڵی مرۆڤەکان، پێناسەی دەکات. ئەو دەڵێت؛ کە چاوەکان درۆ ناکەنو ڕوخساری ناوەوەی مرۆڤەکان دەنوێنن، منیش لەگەڵ ئەوەدام، بەڵام پرسیارێکیش بەردەوام لای من دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە ئایا چاوەکانمان، دەتوانن کام ڕوخسارەمان نیشان بدەن؟ بە کامیان ڕابگەن؟ خۆ ئێمە لە ناخیشماندا، یەك کەس نین، بەڵکو هەزاران وێنەی ئێمە، لەناو ئێمەدا هەیەو هەر جارەو کارەکتەرێکیان بەکار دەهێنین! من دەڵێم: چاوی مرۆڤەکان، زۆر جوانن، بەڵام زۆریش زیرەکن لە فریودانی خۆماندا، پاشان خەڵکدا، چاوەکانمان بەردەوام فریومان دەدەن، هەر بۆیە پەیوەندیی چاوو ناخمان، زۆر باش نییەو بەردەوام لە کێبڕکێدان، بۆ کۆنترۆڵکردنی دەرەوەی ئێمە! ئێمە چ قوربانییەکی ئەو جەنگانەین، کە لە ناخماندا ڕوو دەدەن!! با بگەڕێینەوە بۆ چیرۆکەکەی ڕەجا نەققاش، کە باسی وێنەگرێك دەکات؛ کاتێك ویستوویەتی، وێنەی بێتاوانترین چاو بگرێت، بۆ ئەم مەبەستەش، دەچێتە سەردانی هەتیوخانەیەکو وێنەی کۆمەڵە منداڵێك دەگرێت، یەکێکیان هەڵدەبژێرێت وەك بێتاوانترین چاو، دەڵێت منداڵێکی لێوان لێو لە ئاواتو خۆزگەی قەتیسکراوم بینی، کە چاوێکی ڕەنگ شینی زۆرگەشی ئاوداری هەبوو، هەر کاتێك سەیرم بکردایە، دەمویست پڕ بە دڵم لە ئامێزی بگرم، چونکە بۆنی میهرەبانیو بێتاوانی لێ دەهات، پاش دە ساڵ ئەم وێنەگرە، لە یەکێکی تر لە کارەکانیدا دەیەوێت وێنەی ترسناکترین چاو بگرێت، بۆیە ڕوو دەکاتە بەندینخانەیەکو لە

ناو کۆمەڵێك زیندانیدا، کەسێك هەڵدەبژێرێتو دەڵێت کاتێك وێنەی ئەو بەندکراوەم دەگرت، هەستم بە ترسێکی زۆر دەکرد لە ناخمداو چاوەکانی ئاماژەبوون بۆ ترسناکیو پەیامێکی ئاڵۆزی پێ بوو، پاش لێکۆڵینەوە لە ناوو تەمەنی ئەو کەسە، دەرکەوت ئەو بەندکراوە، هەمان ئەو منداڵە چاوشینە بێتاوانە بووە، کە پێش دە ساڵ لە هەتیوخانەکەدا وێنەی گرتو چاوەکانی وەك بێتاوانترین چاو هەڵبژێردرا..

هەموو ئەمانە، کاریگەریی ئەو خێزانە دەروونییە، کە لە ناخی هەر کەسێکماندا هەیە، سەرەڕای کاریگەرییە دەرەکییەکانی ژیانیش، کە بە تەواوی دەتوانێت بمانگۆڕێت، بۆ نموونە: ئەگەر منداڵی هەتیوخانەکە، لە ژێر سێبەری دایكو باوکیدا، درێژەی بە ژیانی داباو سەرجەم یاساو ڕێنماییەکانی ژیان فێرببوایە، (بەو مەرجەی دایكو باوکیشی، گیرۆدەی ناوەخنی خۆیان نەبن)، ئەوا من لەو باوەڕەدام، چاوە شینە گەشەکانی، هەر وەك خۆی دەمایەوەو هەرگیز نەدەبوو بەو مرۆڤە ترسناکەی لە سووچی بەندیخانەدا، بەنەفرەتەوە سەیری خەڵكو خۆیو هەموو ژیانیش بکات، بەڵام هەر دەگەڕێمەوە بۆ ئەو خاڵەی کە سەرەکیترین هۆکارە بۆ گۆڕانی مرۆڤ، کە بریتییە لە ناوەخنی خۆمان، ئینجا هۆکارە دەرەکییەکان، دەبنە هۆکاری پلە دوو...

ئەو خاتوونە بچکۆلەیەی، کە هەموو هیوای خێزانەکەیەتیو بەردەوام فێری ئەوەی دەکەن؛ چۆن ڕێگە درووستەکان هەڵبژێرێت، کاتێك دەگاتە قۆناغی هەرزەکاری، لەناکاوو بێ ویستی خۆی، سەرجەم خەونەکانی پووچەڵ دەبێتەوەو تاقەتی هیچ شتێکی نامێنێتو دێتو دەچێت بێئەوەی بزانێت؛ کامە ڕێگاکەیەو بەرەو کوێ هەنگاو دەنێت، بڕیاری ئەوە دەدات، تەرکی دنیا بکاتو گۆشەگیرو سەرلێشێواو لە سووچێکدا دادەنیشێتو نە ژیانی بەرەو پێشەوە دەچێت، نە دەتوانێت دەروونی ئارام بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر هاوکاری دەرەکیش بکرێت، تازە هیچ کاریگەرییەکی نابێت، چونکە لە ناوەوە ڕووخاوە، یان ئەو پیاوەی کە تەواوی ژیانی بەبەرنامەو پلان ڕێکخستبوو، لەناکاو دەگۆڕێت بۆ کەسێکی هەڵەشەو تێکڕای بەرنامەکانی ژیانی، دەدات بەسەر یەکدا؛ بەهۆی ئەوەی کە هیچی دەست نەکەوتووە، مایەی دڵخۆشی بێت، بەهۆی لەسەرخۆییەکەیەوەو بەردەوام دواکەوتووە لە خەڵك، چونکە ئەم وا بیر دەکاتەوە، پێویستە لەم سەردەمەدا، ڕیزەکان تێکبشکێنیتو بچیتە پێش هەمووان، بۆئەوەی بە ئامانجەکانت بگەیت، ئەو خاتوونەی بە شەرمەوە دەیڕوانییە هەموو کەس، بەهۆی ئەو شکستەی بەدەستی هێنا، لە پەیوەندییە سۆزدارییەکەیدا، دەبێت بە کەسێکی چاوکراوەو زۆربڵێو هیچ شتێك بە عەیبە نازانێتو بەتەواوی وێنەیەکی نوێ بەرجەستە دەکات، ئەو لاوە دیندارەی، لەناکاو دەگۆڕێت بۆ کەسێکی خراپو خوو دەداتە بێدینیو شەوانە بەسەر شەقامەکانی شاردا، بە باڵە خەیاڵییەکانییەوە دەفڕێت لە مەستیدا، چونکە هەتا دیندار بوو، نەیزانیوە ئازادی مانای چییە، بە دڵی خۆی نەژیاوە، بە ئازادی نەڕۆیشتووە، نەیخواردووەو نەیخواردۆتەوە، بۆیە ڕێگاکەی دەگۆڕێتو ئەمەیان بە باشتر دەزانێت!!

لە ژیانماندا، زۆر وێنەی تر دەبینین، لەم جۆرانە، کە گوزارشت لە سەرگەردانبوونی مرۆڤ دەکاتو قۆناغەکانی وردبوونی ڕۆحو دڵو هەستی مرۆڤەکانمان نیشان دەدەن، بەهۆی ئەو بیرکردنەوە خراپانەی کە هەیانە، ئەو بیرکردنەوانەش لە بنەڕەتەوە، وا نەبوون، هەموو ئەمانە، ڕوویان داوە بەهۆی تێکەڵاوبوونی ئەو کارەکتەرانەی لەناخماندا هەن، لەگەڵ ژیانی ڕاستیماندا، هەر یەکێك لە ئێمە، بریتین لە کۆمەڵێك (ئێمە)، کە لە ناخماندا دەژین، هەر یەکێکیان، وێنەیەکیان هەیەو بە جۆرێکی جیاواز هەڵسوکەوت دەکەن، ئەگەر یەکێك لەوانە زاڵ بێت بەسەر ئەوانی تردا، ئەوا دەتوانێت خۆی بکاتە ماسکی ئێمەو ڕووکاری دەرەوەمان بەدیار دەخات، کەواتە: ئێمە بریتین لە (ئێمەی خراپو ئێمەی باش)! ئەمەش پێچەوانەی وتەی پەروەردگارە، کە دەفەرموێت من ئێوەم بە جوانترینو باشترین شێوە درووست کردووە! کەواتە: دەبێت هەڵەیەك لە پێناسەکەی سەرەوەدا هەبێت، (ئێمە بریتین لە: کۆمەڵێك ئێمە (ئێمەی باشو ئێمەی باشو ئێمەی باش) هەموو ئێمەکان، لەیەك ئاستدان، تاکە هۆکارێك بۆ درووستبوونی گۆڕانکاری، لەو مرۆڤانەی لە ناوەوەماندا دەژین، بریتییە لە: بیرکردنەوەکانمان، خۆمان بە بیرکردنەوەکانمان دەتوانین ئەوان پەروەردە بکەینو ڕۆحی خراپیان تێدا نەهێڵین، ئاستەکانیش بەرزبکەینەوە بۆ (باشو باشترو باشترین)، کاتێك توانیمان بە تەواوی مرۆڤەکانی ناوەوەمان پەروەردە بکەینو لەسەر ڕێچکەیەکی درووستی هەمیشەیی بیانچەسپێنین، ئەوانیش دەبنە ڕۆحێکی زیندووی ڕەنگاو ڕەنگو ڕووخسارو هەڵسوکەوتو ژیانی دەرەکیمان، ڕەنگڕێژ دەکەن بەو بەرنامە هەمەچەشنە ئەرێنیانەی لەلایەن خۆمانەوە تێماندا چاندوون، واتە: لێرەدا (بەخشینو وەرگرتنەوە) هەیە، هەروەك چۆن (چاندنو دوورینەوە) هەیە، سەرەتا پێویستە تۆ ئەو بەچکە مرۆڤانەی ناو ناخت، پەروەردە بکەیتو چرکە بە چرکەو سات بە سات خۆشەویستیو هێزو ژیریان پێ ببەخشیت، بۆئەوەی لە ئەنجامدا ئەوانیش پێ بگەنو هەموو بەرهەمەکانت پێ ببەخشنەوەو لە ژیانتدا ڕەنگ بداتەوە ... ئەمە ئەنجامی ئەو گرێ دەروونییە بوو، کە دەمێکە لای من درووست بووە؛ بۆچی دەبینم کەسێك لە باشەوە، دەگۆڕێت بۆ خراپ، یان لە خراپەوە، دەگۆڕێت بۆ باش، لێرەدا کۆتایی پێ ناهێنمو کۆمەڵە خاڵێك دادەنێم، هەر وەك لە سەرەتادا باسم کرد؛ مرۆڤ حەز بە کۆتایی ناکاتو بەردەوام کۆمەڵە خاڵەکانی ئاماژەن بۆ داوای زیاترو زیاتر، ئێستاش یەکێك لە مرۆڤە بچووکەکانی ناو ناخی من، دەڵێت: ئەم بابەتە هەرگیز بە خاڵ کۆتایی نایەت، پێناسەی ئەو مرۆڤە بچووکەش، کە لە چ جۆرێکە، بەجێ دەهێڵم بۆ ئێوە.......



# شێتی ئەوەیە، کە کارەکان لە ژیاندا دووبارە بکەینەوەو چاوەڕوانی ئەنجامی جیاوازبین!

و: چیمەن لەتیف

پازدە ساڵە ئەحمەدی هاوڕێم، هەمان شت دووبارە دەکاتەوە! لە هەمان کۆمپانیادا کار دەکاتو بە هەمان شێوازی گفتوگۆو بیرکردنەوە، تائێستاش گلەیی لە هۆکارەکانی هاتوچۆ، کەمیی مووچەو دۆڕاندنی بەردەوامی تیپە وەرزشییەکەی دەکات. هەڤاڵەکەم پازدە ساڵە، لە هاویندا قەرز دەکات، تا خۆیو خانەوادەکەی هاوین لە پشوودا بەڕێ بکەن، زستانیش تەواو دەکات، لە دانەوەی قەرزەکانیدا، پازدە ساڵە، بێئەوەی گۆڕانکارییەک ڕوویدا بێت، ئەحمەد بەو شێوەیە ژیان دەگوزەرێنێت!

پازدە ساڵە ئەحمەد، باوەڕی وایە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامیدایە، بەخت ڕۆژێک هەر لە دەرگای دەدات!!

کاتێک تەماشای ژیانی ئەحمەد دەکەم، وتەیەکی ئەنیشتاینم وەبیردێتەوە، ئەو دەڵێت: **شێتی ئەوەیە، کە کارەکان لە ژیاندا دووبارە بکەینەوەو چاوەڕوانی ئەنجامی جیاوازبین!**

دێوانەیی ئەوەیە، بەدوای دڵنیاییو حەسانەوەدا بگەڕێینو لە ژیاندا خۆ بپارێزین لە سەرکەشی، سنوورەکان نەبڕینو دەرگاکان نەکوتین، پاشان سەرسوڕمانی خۆمان، لە دابەشکردنی ڕۆزی؛ لە لایەن پەروەردگارەوە دەرببڕین، کەمتەرخەم بین لەوەی، کە خودا لە گەردووندا یاساو ڕێسایەکی هەیە، نە پشتگیری باوەڕداری پێ دەکاتو نە بێباوەڕییشی پێ دەچەوسێنێتەوە!

سوننەتی پەروەردگار لە گەرووندندا، بێلایەنە.. ئاسوودە ئەو کەسەیە، کە پەڕەکانی ژیانی بە تێفکرینەوە، خوێندووەتەوەو لە تاقیکردنەوەکانی کەڵکی وەرگرتووە. سەرکەوتنو باڵادەستی لە ژیاندا، کارێکی ئەستەم نییە بۆ هیچ کەس، بەڵام لە بەرامبەردا، ئاسانیش نییە، چ کەسێک نایپێکێت ئەوانە نەبێت، کە نرخەکەی دەدەن، نرخی سەرفرازیش، ئارەقی تەوێڵە، نەک گلەوگازندەی تاڵ!

ئەحمەدی هاوڕێمو هەزاران لە هاوڕێکانمو لە هەڤاڵەکانتان، هیچ ناکەن، تەنها لە چاوەڕوانیی سبەینێدا، ژیان بەڕێ دەکەن!

ڕۆژی یەکشەممە، دووبارەی شەممەیە، مانگی ڕێبەندان، هەمان شێوەی ڕەشەمێیە، لە ژیانیاندا بەرەنگارییەک نابینرێت، گۆڕانکارییەک نییە، سەرکەشییەک نابینیت پاڵیان پێوە بنێت...!

وەک زیادەیەک، یان سەربارێک بۆ دڵنیایی وتەکانم دەڵێم: سەرکەشی، مەبەستم لە هەڵچوونێکی شێتانە نییە، بەڵکو مەبەستم هەنگاوی ژیرانەیە، بەڵام ئەو هەنگاوە ژیرانە، پێویستی بە بوێریو ئازایەتیو هاتنە پێشەوەو بڕیاردانو ... هەیە. چەندجار لە دەورانی ژیانتدا، بڕیارێکی چارەنووسسازت داوە، بەشێوەیەک ئەو بڕیارە، لەو ڕۆژگارەوە تا ئەوڕۆ، هۆکار بووبێت لە گۆڕینی ڕێڕەوی ژیانتدا.

(مارک توین) نووسەری ئەمریکی، لەم بوارەدا، وتەیەکی هەیە لەوپەڕی گرنگیدایە، چونکە لە قوڵایی تاقیکردنەوەکانی ژیانەوە، سەرچاوەی گرتووە، ئەو دەڵێت: دوای بیست ساڵ، هەست بە تێکشانو بێهیوایی دەکەم؛ بەرامبەر ئەو شتانەی لە ژیانمدا نەمکردووە، زیاتر بەرامبەر ئەو کارانەی ئەنجامم داوە.

دواتر بەداخ بوویت، ڕەنگە پەشیمانیش بیت، چون بوێر نەبوویت، تا لە بوارێکدا، بڕیارێک بدەیت، بەوە ڕازیبویت دەست بەلێواری ئاسایشو دڵنیاییەوە بگریت.

پاشگەز مەبە لە کۆششەکانت، لەو هەڵانەی لە درێژەپێدانی کارەکانتدا هاتوونەتە ڕێگات، بەئەندازەی پەشیمانیت لە ڕاڕایو ترسو... لە هەوڵدان؛ بۆ ئەو کارانەی ئەنجامت نەداون.

هاوڕێ، هەرکەس لە ئێمە بریتییە لە: کۆمەڵێک هەڵسوکەوت، هەوڵسوکەوتەکانی مرۆڤیش، بە ئەندازەی تواناکانێتی، تواناکانی منو تۆ، تەنها ئەو بڕیارانەیە لە ژیاندا دەیدەین، ئەو کردەوانەیە، کە جێبەجێیان دەکەین، کەواتە: گرنگە، بەشێوەیەکی ئاشکراو دیار، تەماشای گشت ئەو بڕیارانە بکەین، کە ژیان دەیخاتە بەردەستمان، بە چەکی بوێریو ئازایەتییەوە ناوچە نادیارو ترسناکەکانی ژیان گەمارۆ بدەین.

**پوختە: سەرکەشی گەورە ئەوەیە، ژیان سەرکەشی تێدا نەبێتا ترسی گەورە ئەوەیە، ژیان بگوزەرێنیت؛ بەبێ ترس. شکستی ڕاستەقینە، وەستانە لە ترسی سەرنەکەوتن.**

# مەملەکەتی مرۆڤایەتی!

ئارام نەبی

دیسـان بۆ مرۆڤ؟! بەڵێ، دیسـانەوە بۆ مرۆڤ! هێشـتا کەمم نووسـیوەو زۆرم ماوە، بێزار نابم لە نووسـین بـۆ مرۆڤ، دەمێکە دەنووسـم.. وەلـێ، نـە مانـدووم‌و نـە مانـدووش دەبـم، دەمێکە شەونخوونیکردن بۆ مەملەکەتی مرۆڤایەتی پیشەمە، هەرچەندە بۆ مرۆڤ نووسین، کارێکی سەختو گرانە، وەلێ بۆ من کارێکە قەشەنگـو جوان، چێژ لەو کاتانە دەبینم، کە بۆ مرۆڤ دەنووسم! ئاخر مرۆڤ، مەزنترین موعجیزەیە، مەخلوقێکی شـکۆمەندە، دروستکراوێکی تا بڵێی جوانو نازدارە، ئایەتێکی گەورەی پەروەردگارە، بەڕێزترین بوونەوەرە، هیچ دروستکراوێك هێندەی مرۆڤ گرنگی پێنەدراوە، هێندەی مرۆڤ نازی نەکێشراوە، هێندەی مرۆڤ، خزمەت نەکراوە!

بۆیە ناشتوانین ببینین گەورەیی‌و شکۆی مرۆڤ، لەکەدار دەکرێت، ناتوانیـن سـەیری گوزەرانی ئێسـتای مرۆڤایەتی بکەیـن‌و بێدەنگی هەڵبژێرین، ناتوانین تەماشـای ئەم هەموو سـتەم‌و زوڵم‌و زۆردارییە بکەیـن، کـە لە هەقـی مرۆڤایەتی دەکـرێ، لە کۆتاییـدا خۆ دەبێ؛ کەسێك هەبێ‌و هێڵی سوور بۆ ئەو ناکەسانە دابنێت، کە پلان بۆ ئەوە دادەڕێژن؛ مرۆڤایەتی بکەنە دوژمنی یەکدی، زەوی بکەنە مەیدانێکی گەورەی خوێنڕێژی، خۆ دەبێ، کەسێك هەبێ بڵێ: «بەسە ئیتر»!

بەڵێ، بەسە ئیتر، هەتاکەی مرۆڤایەتی یاری پێبکرێ، هەتاکەی مرۆڤ، وەکو ئامرازێك مامەڵـەی لەگەڵدا بکرێت، هەتاکەی خوێنی مـرۆڤ بەحەڵاڵ بزانـرێ، هەتاکەی قبووڵی ئـەم هەموو بێڕێزییە بکەین، کە بەمرۆڤەکان دەکرێت، تاکەی؟!

زەوی، یا چاکتر بڵێین «هەسارەی خوێنڕێژی» هەنووکە بۆ مرۆڤەکان هاوشـێوەی دۆزەخێکە، تێیدا ئازارو ئەشـکەنجە دەدرێن، دەکوژرێن، بە قێزەونترین شێوە لە شەرەفـو کەرامەتو ڕەوشتیان دەدرێت.

دەی فەرمـوو بینەرو بیسـەری هەواڵەکان بـە، تا بزانی ڕۆژانە خوێنـی چەندین مرۆڤ دەڕژێت، شـەرەفی چەندینیان دەبردرێت، ماڵو حاڵـی دەیانیان تێکدەچێ، لە تیڤییەکانـدا، ڕۆژانە قڕکردنی مرۆڤەکان بەدەستی نامرۆڤەکان، بۆتە باسێکی ناکۆتا! کوان ئەوانەی خۆیـان بە خاوەنی مرۆڤایەتی دەزانن؟ لە کوێن ئەوانەی خۆیان بە پێشەنگـو دەمڕاستی مرۆڤایەتی دەزانن؟ کوان بانگەشەکەرانی مافی مرۆڤ؟ کێ بەرپرسی ئەم حاڵەیە، کە مرۆڤایەتی تێی کەوتووە؟!

ئێمەش، لێرەوە، هاوارمان لـێ بەرزبۆتەوە، دەمانەوێ دەنگمان، بگا بە تـەواوی مرۆڤایەتی، لێرەوە دەمانەوێت؛ گەورەترین پڕۆژەو بەرنامەی چاکسـازی‌و پاکسـازی بخەینە بەردەم مرۆڤایەتی، لێرەوە گەرەکمانە، پیرۆزترین پەیام، ئاڕاستەی گرۆهی ئادەمی بکەین!

ئێمـە مەبەسـتمانە، مرۆڤایەتـی لـە تەنگـەژەکان ڕزگار بکەیـن، دەمانەوێ ئاشـتی‌و ئارامی لەتەواوی زەوی بەرقـەرار بکەین، دەمانەوێ مرۆڤایەتـی لە دوولەتبـوون‌و دووبەرەکی‌و ناکۆکییـەکان ڕزگار بکەین، پەیامی ئێمە، پەیامی پێکەوەژیانی گشـت نەتـەوەو نەریتو ئاینەکانە، پەیامـی بـە برایەتیکردنی تەواوی مرۆڤایەتییـە، پەیامی کۆکردنەوەی ڕەنـگـو دەنگـە جیاوازەکانە، پەیامـی ڕێزگرتنە لـە ڕاو بیروبۆچوونە جیاوازەکان،پەیامی لێبوردەیی‌و بەخشـندەیی‌و بەزەییە،پەیامی ئازادی‌و یەکسـانی‌و دادپەروەریی ڕاسـتەقینەیە، پەیامی ڕێزو شکۆیەو گەورەیی بۆ مـرۆڤـو مرۆڤایەتی دەگێڕێتـەوە، تاکە ڕێگاو تەنها چارەسـەرە، کە فریادرەسی مرۆڤەکانە، لە تەنگەژەو کێشەو ناخۆشی‌و نەهامەتییەکان!

بۆ ئەوەی مرۆڤەکان هەمیشە مرۆڤبن!!






ن: د. حذيفه العمقي

و: فێنك جەمال


# بەڵێ، قەدەر جێگیرە!

ئەگەر یارمەتی خۆت بدەیت، خوداش یارمەتیت دەدات، بەڵام لە ئاسمانەوە زێڕو زیوت بۆ نابارێت!

خەڵکی دەڵێن: ئەگەر خودا نووسیبێتی، بچینە دۆزەخەوە، ئەوا ئێمە هەرچییەك بكەین، هیچ ناگۆڕێت! ئەگەر خودا بیەوێت، هەموو ژیانمان نەخۆش بین، ئەوا هەروا دەمێنینەوە!

ئەگەر خودا نووسیبێتی؛ نەزانو هەژار بین، ئەوا هەتا هەوڵ بدەین، هیچ لە بارودۆخەكە ناگۆڕێت!!

كەواتە: گەر ڕۆژێك تووشی خوێنبەربوون بوویت، هیچ مەكە؛ هەر لە شوێنی خۆتدا بمێنەرەوە، خوێنەكە خۆی دەوەستێتەوە!!

بێئەوەی مەلە بزانیت، بچۆرە ناو ڕووبارێكەوە، خۆ ئەگەر خودا نووسیبێتی؛ نەمری.. ئەوا هیچت لێ نایەت!!

بچۆ بۆ شەڕو چەك مەبە، خۆت لە فڕۆكەوە هەڵدەرە خوارەوە، هیچ سەعی مەكە، خۆت هیچ ماندوو مەكە، خودا چی لە چارە نووسیبیت، هەر ئەوەیە! ئایا ئەوانە ڕاستن؟

لێرەدا وەڵامەكەی بخوێنەرەوە: ئەگەر هۆكار نەگۆڕیت، هیچ ناگۆڕدرێت، پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ الرعد: ٣٩

پەیامبەریش دەفەرموێت: (لا يَزيدُ في العمرِ إلَّا البرُّ، ولا يَرُدُّ القَدَرَ إلَّا الدُّعاء، وإنَّ الرَّجُلَ لَيُحْرَم الرِّزْقَ بِخطيئةٍ يَعمَلُها).

ئەوە بزانە؛ كە دوعا قەزاو قەدەر دەگەڕێنێتەوە، ئەگەر خراپە كار بین، ئەوا هەرگیز چاكەمان دەست ناكەوێت:

(هل جزاء الاحسان الا الاحسان)

شاعیر جوانی وتووە:

تا قەلەڕەش سپی هەڵنەگەڕێ

گەنجی بەبێ ڕەنج، قەت دەست ناكەوێ!

نیوتن دەڵێت: سەركەوتن پێویستی بە سێ شت هەیە، كردەوە، پاشان كردەوە، پاشان كردەوە.

كردەوە بە زانست دەست پێدەكات، زانستیش بە خوێندنەوە هەمەدانی، خانووەكەی فرۆشت، تا كتێبی پێ بكڕێت، ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی، كە ئێستا باسی بكەین، ببێت بە یەكێك لەوانەی هەست بكەین، هێشتا زیندووە.

امام هشیم؛ هۆكاری مردنەكەی بەهۆی ئاپۆڕای زۆری زانستخوزان بوو لێی، كە لە گوێدرێژەكەی كەوتە خوارەوەو كۆچی دوایی كرد.

ئەبوبەكری خەیات؛ تەنانەت لە ڕێگاشدا، سەرقاڵی خوێندنەوە بوو، جارێكیان چاوی لە چاڵێك نابێتو دەكەوێتە ناوی.

لێیان پرسی: چۆن زانستت دەستكەوت؟

وتی: بە شەونخونی لە بەر چرا، تا بەیانی.

زیرەك ئەوەیە فێر بێتو خەڵكی فێر بكات، ئەمە هەمان ڕێگەی پەیامبەرانیش بووە، خودا لێیان ڕازی بێت.

* ئایا منداڵێكی بێ باوكی، یان هەژاری!!!!!

هیچ كێشە نییە، هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان، ئەم هۆكارانە نەبوونەتە بەربەست لە بەردەم بوون بە مرۆڤێكی گەورەو ناسراوو خاوەن ئامانجی بەهێزو جێ پەنجەی دیار، بگەڕێرەوە بۆ گۆشەی (ئەو منداڵە بێباوكانەی ڕێرەوی مێژوویان گۆڕی)، كە لە ژمارە (٦٨) بڕیارەوە هەر جارەو باس لە ژیانی منداڵێكی بێباوك دەكات، كە چۆن توانیویانە سەربكەونو بەربەستەكان تێپەڕێننو بگەنە لوتكە! توانییان دوای مردنیان، بەزیندویی لە دڵو مێشكی ئێمەدا بمێننەوە، بچۆ ژیانی هەموو سەركەوتووەكان بخوێنەوە.. یان دانیشە لە لایانو قسەیان لەگەڵدا بكەو بپرسە؟؟؟

هەرگیز كەسێك نادۆزیتەوە، پێت بڵێت: هەر بەسەركەوتوویی لەدایكبووەو هیچ ناخۆشییەكی ژینگەییو خێزانیو جیاوازی بیرو بۆچوونی نەبووە.

ئەگەر خۆشەویستییەكی بەهێزو ڕاستەقینەت هەیە بۆ سەركەوتن، سەركەوتننت بەسەر ترسو شكستدا، بەردەوام لە خەیاڵیدایتو كاری بۆ دەكەیت، ئەوا مژدەت پێ دەدەم؛ بە زوترین كات پێی دەگەیت، تاكە شت كە داوات لێ دەكەم، ئەوەیە: گوێ لەو دەنگەی ناخت بگریت، كە دە لێت: (دەتوانیت ئەنجام بدەیت)!

چیا عەبدوڵا



# بنەماکانی بەختەوەری

## بنەمای دووەم: نواندنی ناوەکی

هەر شتێك، كە ئەنجامی دەدەیت، هەر پێنج هەستەوەرەكەتی لەگەڵدا بەكار دەهێنیت، ئەو ڕێگایەی، كە پێی دەڕوانیتو پێی دەبیستیتو لەزەتی لێوەردەگریتو بۆنی پێدەكەیتو هەستی پێدەكەیت، كاریگەری دەبێت لەسەر هەستت.. ئەو ڕێگایەی كە لەسەری دەژیت، لە هەر ئەزموونێكدا، پێكهاتەیەكی تایبەتی هەیە، با ئەم بیرۆكەیە، تاووتوێ بكەین: بیر لە كەسێك بكەرەوە، كە وات لێدەكات، هەست بە بێتاقەتی بكەیت، هەست بە چی دەكەیت؟ ئێستا بیر لە دەموچاوی بكەرەوەو وای دابنێ؛ دوو گوێی درێژی هەیە، وەك كەروێشك! ئێستا هەست بە چی دەكەیت؟ گەر پێكهاتەی هەر هەڵوێستێك بگۆڕیت، دەتوانیت ئەو ئەزموونە بەتەواوەتی بگۆڕیت، كاتێك هەستی بێتاقەتیت هەیە، ئەوا هەستەوەرەكانت بە شێوازێكی دیاریكراو بەكار دەهێنیت، هەمان شت ڕوو دەدات؛ كاتێك هەست بە بەختەوەری دەكەیت، كە پێكهاتەی تەواو جیاوازە لەوی تر، ئێستا با شێوەو پێكهاتەی هەڵوێستێكی دیاریكراو بگۆڕینو هەست بكە، كە چۆن بەئاسانی دەتوانیت؛ هەستت بگۆڕیت:

- بیر لە هەڵوێستێك بكەرەوە، كە لە ڕابوردوودا، پێیدا تێپەڕبوویتو هەستی بێتاقەتی بۆ دروست كردوویت، كاتێك بیر لەو هەڵوێستە دەكەیتەوە، ڕەچاوی یەكەم شت بكە، كە دێتە مێشكتەوە، ئایا وێنەیەكە دەیبینیت، یان دەنگێكە دەیبیستیت، یان هەستو شعورە، بۆ نموونە: گەر بڵێیت: لە خۆم ڕادەبینم ئەو كارە ئەنجام بدەم، ئەوە یەكەم شت، كە هاتۆتە زیهنتەوە وێنەیە، ئێستا ڕەچاوی دووەم شت بكە، كە دێتە زیهنتەوە، لە دوای وێنەكە، ئایا دەنگە، یان هەستە، گەر وتت: دەنگە، ڕەچاوی ئەو دەنگە بكە، بزانە دەنگەكە چییە، یان كێیە؟ دەنگی خۆتە، یان دەنگی كەسێكی تر، ڕەچاوی ئەوە بكە، چی بە خۆت دەڵێیت، هەندێك وا دەڵێن: من هەست بە دڵتەنگی دەكەم، یان من ماندووم.. بزانە؛ بەڕوونی چی بە خۆت دەڵێیت، ئێستا ڕەچاوی هەستت بكە بزانە هەست بە چی دەكەیت، بزانە ئەو هەستە لە كوێی جەستەتدایە، ئایا لە گەدەتدایە، یان لە سنگتدایە، یان لە شانتدایە، یان لە سەرتدایە، ئێستا پێكهاتەیەكی تەواومان هەیە، بۆت ڕوون دەكاتەوە، كە چۆن هەستی دڵتەنگی، لە ناختدا، خۆی دەنوێنێت. بێگومان ئەم پێكهاتەیە، ڕەنگە لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر بگۆڕێت، بۆ نموونە: ڕەنگە دەنگەكە، یەكەم جاربێتو پاشان هەست بێت، پاشان وێنەبێت، یان ڕەنگە هەستەكە یەكەمجار سەرهەڵ بدات، پاشان وێنەو پاشان دەنگەكە دێت، ئێستا ڕەچاوی ئەوەبكە، كە وێنەكە لە كوێدایە، ئایا لە پێشتەوەیە، لای ڕاستتە، یان لە لای چەپتەوەیە، وا بیهێنەرە پێش چاوت، كە ئەم وێنەیە، بەتەواوەتی لێت دوور دەكەوێتەوە، ئێستا ڕەچاوی هەستت بكە، بزانە؛ هەست بە چی دەكەیت؟ ئێستا دەنگەكە وەربگرەو بیگۆڕە بە دەنگێك، كە دەڵێت: (من بەهێزم، من بەهێزم)، پاشان هەناسەیەكی قووڵ هەڵمژە، لە كاتی دانەوەی هەناسەكەدا، هەموو گرژیو هەستە سلبییەكانی لەگەڵدا فڕێ بدەرە دەرەوە، ئێستا وێنەكە بگۆڕەو وابیر لە خۆت بكەرەوە، كە هەست بەئاسوودەییو بەختەوەری دەكەیت، دیسان بڵێ: (من بەهێزم)و بەقووڵی هەناسە بدەو زەردەخەنەیەك بخەرە سەر لێوت، ئێستا هەستت چۆنە؟ كاتێك جووڵەی جەستەت دەگۆڕیت، لەگەڵ ئاماژەكانی ڕوخسارتداو پاشان وێنە ناوەكییەكان، ئەو كاتە دەتوانیت، یەكبینە هەستەكان بگۆڕیت.

ئێستا ڕەچەتەیەكی بەهێزت پێ دەدەم، كە لەم ڕێگایەوە بتوانیت؛ هەستێكی سلبی بگۆڕیت، بۆ ئیجابیو هەست بەئاسوودەییو ئارامی بكەیت:

ئێستا هەستێكی سلبی بنووسە، كە كاریگەری لەسەرت هەیە.. بنووسە، كە بۆچی تۆ ئەم هەستەت بۆ دروست دەبێت.. ئەم كاغەزە بدڕێنەو فڕێی بدە بۆ شوێنێكی دوور. لە پاش ئەمە، هەستێكی ئیجابی بنووسە، كە حەز بكەیت هەستی پێ بكەیت، بیر لە خۆت بكەرەوە بەو هەستو شعورەوە، چاوەكانت دابخە، ڕەچاوی یەكەم شت بكە، كە دێتە خەیاڵتەوە. كاتێك بیر لەو هەستە دەكەیتەوە، ئایا شتێكە دەیبینیت، یان دەیبیستیت، یان هەستی پێ دەكەیت، ڕەچاوی دووەم شت بكە، بزانە؛ چییە؟ پاشان سێیەم شت، وێنەكە بگۆڕەو لێی نزیك بەرەوە، پاشان گەورەی بكەو بچۆرە ناوی، پاشان دەنگەكە بگۆڕە، زیاتر بەرزی بكەرەوە؛ با بەهێزتر بێت، جووڵەی جەستەت بگۆڕە، سەرت بەرزبكەرەوەو شانەكانت جوان ڕابگرە، بەقووڵیو بەهێزەوە هەناسە بدەو بڵێ: (من بەهێزم)، (٥) جار بیڵێرەوەو زەردەخەنەیەك بخەرە سەر ڕووخسارت، ئێستا هەستت چۆنە؟!



# حافز ئیبراهیم

# ١٨٧٢ - ١٩٣٢

بەهەرە، وەکو گوڵ وایە، لە ژووری تاریکدا گەشە ناکات، پێویستی بە بڕێك تیشکی خۆر هەیە!

ئەدیبی شارەزاو بە تواناو ناودار، شاعیر (حافز ئیبراهیم)، شاعیری بە توانا، یەکێکە لە سوارچاکەکانی شیعر لە سەردەمی ڕاپەڕینی شیعریدا..

(حافز ئیبراهیم)، باوکی میسری بووەو دایکی تورك بووە، لە شاری دەیروت؛ سەربە پارێزگای ئەسیوتی میسر، لە ٤ فیبرایەری ساڵی ١٨٧٢ لەناو کەشتییەکی بچکۆلەداو لەناو ڕووباری نیلدا، لەدایکبووە، حافز ئیبراهیم، هەروەکو منداڵە بێباوکەکانی دیکە، هەر زوو باوکی جێیهێشتووە، ئەو کات تەمەنی تەنها چوار ساڵان بوو، کە باوکی ماڵاوایی لە ژیان کردووە، دواتر لەگەڵ دایکیدا، ڕۆیشتووە بۆ قاهیرە؛ بۆ ماڵی خاڵی، بەڵام حافیز، دوای ئەوەی چاوی کرایەوەو کەمێك گەورەبوو، هەستی کرد؛ کە بووەتە بارگرانی بۆ ماڵی خاڵی، بڕیاری دا بڕواتو ماڵی خاڵی جێ بهێڵێتو پشت بە خۆی ببەستێت.

سەرەتای ژیانی حافیز، بە کۆمەڵێك کۆسپو ناڕەحەتیو دەردەسەریو خەمو ئازار دەستی پێکرد، کۆسپەکانی ژیانی سەرەتا بە کۆچی دوایی باوکی دەستی پێکردو دواتر ژیانو گوەران لە ماڵی خاڵیو دواتریش ڕاکردن لە ماڵو بەرگەگرتنی غەریبیو دەربەدەریو تەنهایی، ئەم ناڕەحەتییەش لە شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە.. حافزبە کەسێکی نیشتمانپەروەرو خۆشەویستی بۆ زمانی دایكو گەلەکەی ناوبانگی دەرکردووە.

حافزدوای تەواوکردنی خوێندن، لە سەرەتای دەستبەکاربوونیدا، یەکەم کاری، پارێزەری بووە، ماوەیەك کاری پارێزەری دەکات، دواتر ساڵی ١٨٨٨ لە قاهیرە پەیوەندی دەکات بە خوێندنگەیەکی سەربازییەوە، لە ساڵی ١٨٩١ خوێندنی سەربازی لەو خوێندنگەیە تەواو دەکاتو پلەی مولازمی دووی پێ دەبەخشرێت لەناو سوپای میسریدا، پاشان لە ساڵی ١٨٩٦ لەگەڵ کاروانێکی سەربازی میسریدا، نێردراوە بۆ وڵاتی سوودان.

حافزئیبراهیم، سەبارەت بە دینو دونیا، ئێستاو ڕابردوو، نیشتمانو هاونیشتمانی، پیاوو ئافرەت، بەرهەمی هەیەو نووسیویەتی.. حافزهیچ شتێکی لە یاد نەکردووەو شیعری بۆ هەمووان نووسیوە، بە شێوەو شێوازێکی ئەندازیاریی زۆر جوانو بەهێز دایڕشتووە، سەرجەمی شیعرەکانی زۆر جوانو نایابو بۆنو بەرامەیەکی خۆشە، وەکو ئەوەی لە ڕووبارێکی سازگاری درەوشاوەدا، هەڵقوڵا بێت..

شیعرەکانی حافزواتاو مەبەستیان ڕوونەو لێوان لێون لە تازەگەری، بەردەوام ماناکانیان تازە دەبنەوە، بە ئەندازەیەك هەر کات دەیانخوێنیتەوە، وا هەست دەکەیت، کە لە ئێستاداو بۆ ئێستا نووسراوون، لەگەڵ تێپەڕبوونی چەندین ساڵ بەسەر

نووسینەکانیدا، تەنانەت هەندێك لە نووسینەکانی، سەدەیەك بەسەر نووسینیاندا تێپەڕیووە، حافزپێشبینی ڕووداوەکانی گەلەکەی ئازارو مەینەتییەکانی کردووە، ڕاڤەی خەونەکانیو کردووەو بەردەوام هیواکانی نوێ کردۆتەوە.

پەیوەندی لەگەڵ زۆرێك لە گەورە پیاوانو سیاسەتمەدارانو بیرخوازانو پیاوانی ئاینیو ئەدیبو نووسەراندا هەبووە، بەتایبەت پێشەوا محەممەد عەبدە.

حافزناوەکەی بەستراوەتەوە بە ناوی ئەمیری شاعیران ئەحمەد شەوقییەوە، تەنانەت لە یەك ساڵدا، کۆچی دواییان کردووە، ئەحمەد شەوقی لە ژیانی خۆیدا، شانازی کردووە بە هاوڕێیەتی حافزئیبراهیمەوە، فەزڵی حافیزی داوە، بەسەر هەموو هاوڕێکانی دیکەیدا..

شەوقی لە زۆرێك لە گەشتەکانیدا، هاوڕێیەتی حافزئیبراهیمی کردووەو پێکەوە گەشتیان ئەنجام داوە، شەوقی زۆر پاڵپشتی لە حافزدەکرد، بەشداریی پێکرد لە نازناوەکەی خۆیدا، هەوڵی دا لە ڕۆژنامەی ئەهرام، دایبمەزرێنێت.. بەڵام هەوڵەکەی سەرکەوتوو نەبوو، لەبەرئەوەی خاوەنی ڕۆژنامەی ئەهرام، مەیلی بۆ ئینگلیز هەبوو، لە نێردراوی بەریتانیا (لۆرد مرۆمەر)یش دەترسا.

حافزلە ژیانی خۆیدا، دیوانێکی چاپ کردووە، کە لە سێ بەشی بچووك پێکهاتووە، لە ساڵی ١٩٠١- ١٩١١، دوای کۆچی دوایی، جارێکی دیکە چاپکرایەوە، حافزخاوەنی بەرهەمێکی دیکەیە، لەسەر شێوازی مەقامات بە ناونیشانی (ليالي السطيح)، هەروەها ڕۆمانی (البؤساء: بێنەوایان)ی ئەدیبی فەرەنسی: فیکتۆر هیگۆی وەرگێڕراوە بۆسەر زمانی عەرەبی.

حافیز، بە سێ سیفاتی سەرەکی، ناوبانگی دەرکردووە، هەموو ئەوانەی لەگەڵیدا ژیاون، باسیان لەم سێ سیفاتە کردووە، ئەوانیش (قسەخۆشی، بەخشندەیی، نوکتەو گاڵتەوگەپکردن).

حافیز، لە جەماوەرەوە زۆر نزیك بووە، ئەوەش وای کردووە، کە بتوانێت هەستیان بخوێنێتەوە، لەو کاتەدا کە دەروونیان گڕی گرتبوو، دژی داگیرکەری ئینگلیز، لەبەرئەوە نازناوی شاعیری نیلی پێبەخشراوە.

بەناوبانگترین شیعرەکانی شیعرێکە بەسەر زمانی عەرەبیدا، (تنعى حظها بين اهلها)، کە باس لەبەرگریکردن لە زمانی عەرەبی دەکات، دژی ئەوانەی لە زمانی عەرەبی هەڵدێنو هەوڵی بەکارهێنانی زمانی دیکە دەکەن..

یەکێکی دیکە لە شیعرە بەناوبانگەکانی حافزئەو شیعرەیە کە سەبارەت بە دایك نوسیوێتی: **قصيدة الأم**

إنّي لَتُطرِبُني الخِلالُ كَرِيمَةً ** طَرَبَ الغَريبِ بأَوبَةٍ وَتَلاقِ
وَتَهُزُّني ذِكرى المُروءَةِ وَالنَدى ** بَينَ الشَمائِلِ هِزَّةَ المُشتاقِ
فَإذا رُزِقتَ خَليقَةً مَحمودَةً ** فَقَدِ اصطَفاكَ مُقَسِّمُ الأَرزاقِ
فَالناسُ هَذا حَظُّهُ مالٌ وَذا ** عِلمٌ وَذاكَ مَكارِمُ الأَخلاقِ
وَالمالُ إن لَم تَدَّخِرهُ مُحَصَّناً ** بِالعِلمِ كانَ نِهايَةَ الإملاقِ
وَالعِلمُ إن لَم تَكتَنِفهُ شَمائِلٌ ** تُعليهِ كانَ مَطِيَّةَ الإخفاقِ
لا تَحسَبَنَّ العِلمَ يَنفَعُ وَحدَهُ ** ما لَم يُتَوَّج رَبُّهُ بِخَلاقِ
مَن لي بِتَربِيَةِ النِساءِ فَإنَّها ** في الشَرقِ عِلَّةُ ذَلِكَ الإخفاقِ
الأُمُّ مَدرَسَةٌ إذا أَعدَدتَها ** أَعدَدتَ شَعباً طَيِّبَ الأَعراقِ
الأُمُّ رَوضٌ إن تَعَهَّدَهُ الحَيا ** بِالرِيِّ أَورَقَ أَيَّما إيراقِ
الأُمُّ أُستاذُ الأَساتِذَةِ الأُلى ** شَغَلَت مَآثِرُهُم مَدى الآفاقِ
أَنا لا أَقولُ دَعوا النِساءَ سَوافِراً ** بَينَ الرِجالِ يَجُلنَ في الأَسواقِ
يَدرُجنَ حَيثُ أَرَدنَ لا مِن وازِعٍ ** يَحذَرنَ رِقبَتَهُ وَلا مِن واقِ
يَفعَلنَ أَفعالَ الرِجالِ لِواهِياً ** عَن واجِباتِ نَواعِسِ الأَحداقِ
في دورِهِنَّ شُؤونُهُنَّ كَثيرَةٌ ** كَشُؤونِ رَبِّ السَيفِ وَالمِزراقِ
تَتَشَكَّلُ الأَزمانُ في أَدوارِها ** دُوَلاً وَهُنَّ عَلى الجُمودِ بَواقي
فَتَوَسَّطوا في الحالَتَينِ وَأَنصِفوا ** فَالشَرُّ في التَقييدِ وَالإطلاقِ
رَبّوا البَناتِ عَلى الفَضيلَةِ إنَّها ** في المَوقِفَينِ لَهُنَّ خَيرُ وَثاقِ
وَعَلَيكُمُ أَن تَستَبينَ بَناتُكُم ** نورَ الهُدى وَعَلى الحَياءِ الباقي

* حافزلە کەسە بەتواناکانی سەردەمی خۆی بووە، نەك تەنها لە بواری شیعریدا، بەڵکو لە توانای لەبەرکردن، کە چەندان ساڵ بەرگەی گرتووەو دوور بووە لە لاوازبوونو لەبیرچوونەوە، بە درێژایی شەست ساڵ، خاوەنی هزرهۆشێکی هێندە بەهێزبووە، کە هەزاران شیعری عەرەبیی کۆنو تازەی لەبەر کردووەو سەدان کتێبی خوێندووەتەوە، بە شایەتی دۆستانو هاوڕێیانی، بە شێوەیەك لە خوێندنەوەی خێرادا لێهاتوو بووە، کە توانیویەتی دیوانە شیعرێك، بە چەند خولەکێك بخوێنێتەوە، دوای خوێندنەوەشی، نموونەی بە چەندی شیعری دیوانەکە هێناوەتەوە.

## کۆچی دوایی حافز

لە شەوی یونیوی ساڵی ١٩٣٢ حافزدووان لە هاوڕێکانی بانگهێشت کرد بۆ خوانی ئێوارە، بەڵام نەیتوانی درێژە بە دانیشتن بدات لەگەڵیاندا بە هۆی نەخۆشییەکەوە، کە هەستی پێکرد، دوای ئەوەی هاوڕێکانی بەجێیان هێشت، نەخۆشییەکەی توندتر بوو، داوای لە خزمەتکارەکەی کرد، کە بڕوات پزیشك بهێنێت، تا خزمەتکارەکەی گەڕایەوە لەگەڵ پزیشکەکەدا، حافزلە کۆتایی ژیاندا بوو، کورد وتەنی: گیانی دەدا، کاتژمێری پێنجی بەرەبەیانی ڕۆژی پێنج شەممە، لە ١٢ یونیوی ساڵی ١٩٣٢ ماڵاوایی لە ژیان کردو لە گۆڕستانی خاتوو نەفیسە، بەخاك سپێردرا.

کاتێك حافزکۆچی دوایی کرد، شەوقی لە ئەسکەندەرییە بوو، دوای ئەوەی سکرتێرەکەی هەواڵی مردنی حافیزی زانی، دوای سێ ڕۆژ، هەواڵەکەی بە شەوقی ڕاگەیاند، چونکە دەیزانی بە مردنی حافیز، زۆر نیگەران دەبێت. بە هۆی نزیکیو خۆشەویستیی هاوڕێیەتی نێوانیان، شەوقی ماوەیەك سەری داخستو دواتر سەری هەڵبڕیو چەند دێڕە شیعرێکی بۆ کۆچی دوایی حافزنووسیو تیایدا خەمباریو نیگەرانی خۆی، بۆ کۆچی دوایی حافزدەربڕی!

جەلال عەبدوڵا حاجی

# خوایە وەتەن ئاواکەی...

بەسەرچوونی وەرزی زستان، واتە: تێپەڕبوونی سەرماوسۆڵە، ئیتر بەفرو سەرما، لێزمە بارانو شەوی درێژ، بەرەو کەمبوونەوە دەچن، دەرکەوتنی گوڵاڵە لە قەدپاڵی چیاکان، لە ڕۆژی نەورۆزدا، مژدەی هاتنی وەرزی بەهار ڕادەگەیەنێت، وەرزی گەشەکردنو نوێبوونەوە، گەر لە وەرزەکانی ساڵ ڕابمێنین، بۆمان دەردەکەوێت، ئێمەی مرۆڤیش، تەمەنمان دابەش بووە بەسەر چەند وەرزێکدا، لەدایکبوونو گەشەکردنو منداڵی، پاشان تواناو هێزو گەنجی، ئینجا قۆناغی خێزانداریتیو دەرکەوتنی داناییو تێڕامان، هەروەها بینینی دیوی پشتەوەی ڕووداوەکان، پاشان قۆناغی کامڵبوونی تەواوو بەساڵاچوون. دەتوانین وانەیەکی تریش، لە وەرزەکانی ساڵەوە فێر ببین، پێمان دەڵێت ئەگەر بتوانیت ئارام بگریت، ئەوا لەدوای وەرینی گەڵای درەختو سەرماو کڕێوە، دەتوانیت دەشتودەری سەوزی پڕ لە گوڵاڵەو باخی پڕ لە میوە ببینیت.

بەهاتنی وەرزی بەهار، پلەکانی گەرما، بارێکی مامناوەند وەردەگرێت، خەڵکانێکی زۆر، ڕوو دەکەنە چیاو دۆڵو دەشتەکان؛ بۆ بەسەربردنی کاتێکی خێزانی پێکەوە، زۆر کەس بەهەلی دەزانن بۆ چێژوەرگرتن لە خۆشترین ساتەکانی ساڵ، سینەیان پڕ دەکەن لە هەوای خاوێن، چاوەکانیشیان تێر دەکەن بە تێڕامان لە سرووشتی خواکرد، ئەو سرووشتە جوانە، کانیاوی ڕوون، دەنکە زیخەکانی وەك مرواری دەدرەوشێنەوە، جۆگەلەو ڕووباری پڕخێر، بەرەو نزمایییەکان کەوتونەڕێو بەهەرجێگەیەکدا برۆن ئاوەدانی دەکەنەوە، شاخو دۆڵو دەشت، بەرگی ژیانەوەیان پۆشیوە، درەختی سەر لوتکە بە ئازادی دەشنێتەوە، پیرە درەختی پێدەشتەکانیش، لقەکانیان درێژ کردووە، بۆئەوەی زۆرترین سێبەر، بۆ ڕێبواران درووست بکەن. ئایا پێویست نییە لەسەرمان، هاوسۆزیی خۆمانی بۆ دەرببڕینو خاوێن ڕای بگرین، بە بەشێك لە خۆمانی بزانین؟ چونکە ئەمانەتێکە؛ لەبن دەستی ئێمەدایە، پاراستنی ئەرکێکە، لەسەر شانمان.

لێرەدا، کۆمەڵێك ڕێنمایی دەخەینە بەرچاو، مەبەستمان هۆشیارکردنەوەیە، بۆئەوەی لەکاتی دەرچوون بۆ گەشتو سەیران، لەبیرت بێت.. هەرچەندە بەهۆی ئەو بارە ناهەموارەی، کە کوردستانی پێدا تێپەڕدەبێت، ڕەنگە خەڵکانێکی زۆر، نەتوانن گەشتو دەرچوون بکەن، بە ئومێدی زوو تێپەڕبوونی زریانی شەڕو ئاژاوەو دەرکەوتنی بەهارێکی نوێ بۆ نەتەوەکەمانو تەواوی گەلانی ناوچەکە:

١- هەوڵ بدە؛ شوێنێك هەڵبژێرە، سەلامەت بێت لە هەموو ڕوویەکەوە، بۆئەوەی چێژ لە سەیرانەکەت وەربگریت، نابێت موڵکی تایبەتی کەسی بێتو پێی ناخۆش بێت، جێگەیەکی سەلامەت بێت بۆ منداڵان، دووربێت لە مینو تەقەمەنی.

٢- دەبێت دڵنیابین لە جۆری خواردن، ڕەنگە هەندێجار خراپ هەڵگرتنی خۆراك، لە شوێنی گەرمدا، یان خۆراکی بەسەرچوو ببێتە هۆی گرفتی تەندرووستی.

٣- بۆ سەلامەتی منداڵان: یەکەم: شوێنێك هەڵبژێرە، با دووربێت لە ڕێگای سەرەکییەوە، چونکە منداڵان، حەزیان لە یاریکردنە بە تۆپ، ڕەنگە ڕووداوی ناخۆش ڕوو بدات. هەروەها ئاگادارکردنەوەی منداڵ، لەوەی نەچنە ئەو شوێنانەی کە گژوگیاو پووشی چڕی لێیە، ڕەنگە مارو مێرووی زیانبەخشی تێدابن.

دووەم: بەهۆی سەرقاڵی دایكو باوکەوە بە چێشتو قسەو باسەوە، منداڵان لاسای گەورەکان دەکەنەوە، دەستکاری ئۆتۆمبێلەکان دەکەنو ڕووداوی ناخۆش ڕوو دەدات.

سێیەم: تیشکی خۆر، کاریگەری هەیە لەسەر منداڵان، با کڵاو، یان کاسکێت لەسەر بکەن.

چوارەم: نەوتو سووتەمەنی، مەکەنە ناو دەبەی ئاوەوە، چونکە منداڵ دەیخواتەوە.

پێنجەم: نزیك نەکەوتنەوەی منداڵان لە ڕۆخی ڕووبار بەتەنیا.

٤- ڕاگرتنی پاکوخاوێنی سەیرانگاکە، بەجۆرێك بە ماڵی خۆتی بزانە. لە کاتی کۆکردنەوەی کەلوپەلەکانتدا، شوێنەکە بەتەواوی خاوێن بکەرەوە، باشترین کاتە بۆ فێرکردنی منداڵ، داوایان لێبکە؛ هەر پاشماوەیەك کەوتووە، بیکەنە ناو نایلۆنە بەکارهاتووەکانەوە، وەك قاپو کەوچکی سەفەری، بوتڵی شووشە، کاغەز، دەبەی ئاو...هتد، لەگەڵ خۆتاندا بیهێننەوە، دەتوانیت لە ڕێگاداو لە شوێنی شیاودا دایبنێیت، ئەم کارە، هەستێکی خۆشت پێدەدات، لە ڕاستیدا ئەم کارە، نیشانەی مرۆڤدۆستیو خەمخۆریی ئێوەیە بۆ ژینگەو بۆ ئەو مرۆڤانەی ئێستا دەژینو ئەوانەش، کە لە داهاتوودا دێن. لەبیرت نەچێت؛ ئاگرەکە بکوژێننەوە؛ کاتێك ویستت شوێنەکە بەجێ بهێڵیت، بۆئەوەی زیانی گەورەی لێنەکەوێتەوە.

پێشنیارێك بۆ یارمەتیدانی ژینگەی کوردستان، لە کاتی گەشتکردندا، دەتوانیت نەمام، قەڵەم (موتوربە)، یان تۆو لەگەڵ خۆت ببەیت، ئەگەر شوێنێکی شیاوت دەستکەوت، تێیدا بڕوێنە، بەتایبەت شوێنێك، بزانیت لە هاویندا ئاوی لێنابڕێت، یان شێدارە بۆ گەشەکردنی نەمامەکە.. خودای گەورە، هەموو لایەك سەلامەت بکات.




## تۆماس ئەدیسۆن (١٨٤٧ -١٩٣١)..

# ئەو زانایەی هەوڵی دا، شەو بە وێنەی ڕۆژ ڕووناک بکاتەوە!

ئەدیسۆن بەناوبانگترین داهێنەر لە مێژوودا، کە لە زۆربەی داهێنانەکاندا، نموونەی پێدەهێنرێتەوە، ئەدیسۆن ئەو داهێنەرەی کە بەرگەی ناڕەحەتیی کارکردنی گرتووە، ژمارەی داهێنانەکانی نزیکەی ١٠٩٣ داهێنانە، کە زۆربەی بوارەکانی ژیانی گرتۆتەوە،

بەشێوەیەك کە مرۆڤ ناتوانێت بێ نیاز بێت لە داهێنانەکانی! ئایا دەتوانین لە ژیاندا پێویستیمان بە گلۆپو ڕووناکی گلۆپەکان نەبێت؟

ئەدیسۆنی داهێنەر، هەموو ئەو تواناو لێهاتوویيەی، کە هەیبوو، لە ١٪ی بەهرە بوو، لە ٩٩٪ ماندووبوونو هەوڵدان بوو، دکتۆر مایکڵ هارت، لە ڕیزبەندیی سەد کەسایەتییەکەی جیهان، بە سیو هەشتەمین کەس ناوی بردووە، ئەدیسۆن گەورەترین کاریگەری، لەسەر ژیانی مرۆڤایەتی هەبووە!

ئەو تاکە زانایەیە، کە هەوڵی دا، شەو بە وێنەی ڕۆژ، ڕووناك بکاتەوە!

ئەدیسۆن لە قوتابخانەی دەوڵەت فێر نەبووە، ئەو تەنها سێ مانگ لە قوتابخانە خوێندوویەتی، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی پێی وابووە، ئەدیسۆن منداڵێکی کەودەنو دەبەنگو دواکەوتووە لە ژیرییدا. لەبەرئەوە دەنێریت

بە دوای دایکیدا دەڵێت: دەستی منداڵەکەت بگرەو لەگەڵ خۆتدا ببیەرەوە ماڵ، چونکە منداڵەکەت هیچ شتێك فێر نابێت، ئێمە قوتابخانەمان بۆ ئەو جۆرە منداڵانە بنیاتنەناوە!

دایکی پاڵەوانئاساو وەکو پەروەردەکارێکی بەئەزموون، هەر لەو ساتەوە، کە لە قوتابخانە دەریان کرد، لە بری سەرزەنشتو گازندەو گلەیی، دەستی بەسەردا هێنیو لە ئامێزی دەگرێو دەڵێت: کوڕی شیرینم، من دڵنیام، تۆ دەبیتە داهێنەرێکی گەورە!

ئەدیسۆن ئەو چاکەیەی دایکی لە یاد نەکردووە، تا ئەو ساتەی لە ژیاندا بوو هەمیشە دەیگوت: دایکم گەورەترین کاریگەری هەبووە لە ژیانمدا، دایکم ئەو کەسەی منی پێگەیاند، چونکە ئەو لەوپەڕی نائومێدیدا، وای لێکردم متمانەم بە خۆم هەبێت، ڕێزی گرتم، ئەو هەمیشە دەیگوت: تۆ کەسێکی گرنگی لە ژیاندا، تا وای لێکردم، کە من هەست بکەم؛ بوونی من پێویستە بۆ ژیان، منیش لە بەرامبەر ئەو هەموو چاکانەیدا، بەڵێنم داوە، کە هەرگیز وازی لێنەهێنمو تەنیا جێی نەهێڵم، تا ئەو ساتەی لە ژیاندا بم، هەروەکو چۆن ئەو وازی لە من نەهێناوەو تەنیا جێی نەهێشتووم.

### سەرەتای ژیانی ئەدیسۆن:

ئەدیسۆن لە شاری (میلانۆ) لە ویلایەتی ئۆهایۆی ئەمریکی لە ١٨٤٧/٢/١١ لەدایك بووە، لە سەرەتای ژیانیدا دوای ئەوەی لە قوتابخانە دەرکرا، لە سکەی شەمەندەفەرەکاندا، دەستی بە فرۆشتنی ڕۆژنامە کردووە، سەرەتا ڕۆژنامەکان سەرنجی ئەدیسۆنی بۆ کرداری چاپکردن ڕاکێشا، تێیدا قووڵو ڤاڵ بوویەوەو فێری نهێنی ئەو کارە بوو، لە ساڵی ١٨٦٢، هەستا بە دەرکردنی هەفتەنامەیەك، بە ناونیشانی (Grand Herald Trunk).

### داهێنانەکانی ئەدیسۆن:

لێهاتوویی و بلیمەتیی ئەدیسۆن، لە داهێنانەکانیدا وەدەرکەوت، لە داهێنانەکانی (تۆماری هەڵبژاردن، چاپی دەروەشەدار، تەلەفۆن، مایکرۆفۆن، فۆتۆگراف، گرامافون، گەورەترین داهێنانیشی گڵۆپی کارەبایی بوو، لە ساڵانی کۆتایی ژیانیشیدا وێنەی جووڵاوو قسەکەری داهێنا، لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، لە بەرژەوەندیی حکومەتی ئەمریکا کاری کردووە، بە ناوی ئەدیسۆنەوە، زیاتر لە هەزار داهێنان تۆمارکراون، ژمارەی داهێنانەکانی ئەوەندە زۆرن، کە بە ئەستەم ژیریی مرۆڤ، باوەڕ دەکات.

ئەدیسۆن یەکەم ئامێری تەلەگرافی داهێنا، دواتر پەرەی بە کارەکەی داو گواستییەوە بۆ ویلایەتی بۆستن، لە ویلایەتی ماساچوستس، تاقیگەیەکی دامەزراند، لە ساڵی ١٨٧٦، ئامێری برووسکەناردنی داهێنا، پاشان گرامافۆنی داهێنا، کە هەڵدەستا بە تۆمارکردنی دەنگێکی میکانیکی، لەسەر قەوانێکی کانزایی.

دوو ساڵ دوای ئەوە، گەورەترین داهێنانی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کرد، ئەویش داهێنانی گڵۆپی کارەبایی بوو، داهێنانەکە ئەوەندە گەورەبوو کە لەماوەیەکی کورتدا گەیشتە دەستی ملیۆنان کەس لە جیهاندا، دوای دیزاینکردنی یەکەم وێستگەیی کارەبایی لە جیهاندا، لە ساڵی ١٨٨٧ تاقیگەکەی گواستەوە بۆ (وێست ئۆرەنج) لە ویلایەتی نیوجێرسی.

- لە ساڵی ١٨٨٨ ئامێری (KINETOPSCOPE) داهێنا، کە یەکەم ئامێرە، بۆ کاری فیلمسازی، لە ساڵی ١٩١٣ یەکەم فیلمی سینەمایی دەنگی بەرهەم هێنا، هەروەها تەلەفۆنو ئامێری نووسینو مۆلیدەی کارەباییو وێستگەی کارەباییو پاتری خەزنکردنیشی داهێناوە.

لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، پاسایەکی بۆ بەرهەمهێنانی بەنزینو پێکهاتەکانی لە ڕووەك داهێنا، لەو ماوەیەدا، دیاری کرا بۆ ڕاوێژکاری سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

شکست لە بیرکردنەوەو داهێنانەکانیدا نەبوو، کاتێك ١٠٠٠٠ دە هەزار جار ئەزموونی شتێکی دەکردو تاقی دەکردەوە، یەکێك لە هاوڕێکانی دڵنەوایی دایەوە، بەڵام ئەدیسۆن وتی: بۆچی؟ من شکستم نەهێناوە. بەڵکو دە هەزار ڕێگەم دۆزیوەتەوە، کە ناگەیەنێتە ئامانجی دیاریکراو.

### نیشانەو مەدالیاکانی کە بە دەستی هیناوە:

* خەڵاتی (ئەلبێرت)ی پێبەخشرا، لە زانکۆی شاهانە، لە بەریتانیا.

* لە ساڵی ١٩٢٨، مەدالیای ئالتونی لە کۆنگرێس پێبەخشرا.

### لە وتە بەناوبانگەکانی ئەدیسۆن:

* من لەو شوێنەوە دەست پێدەکەم، کە دواین کەس تیایدا کۆتایی پێهێناوە!

* من هیچ یەکێك لە داهێنانەکانم بە ڕێکەوت دانەهێناوە، بەڵکو بە ماندووبوونێکی زۆرو هەوڵدانو بەردوامبوون!

* ئەگەر شتێك بەوشێوەیە کاری نەکرد کە تۆ دەتەوێت، مانای ئەوە نییە، ئەو شتە سوودی نییە!

* ئەدیسۆن، لە داهێنانەکانی بۆ خزمەتکردنی جیهان بەردەوام بوو، تا ئەو ساتەی ماڵاوایی لە ژیان کرد، لە (وێست ئۆرەنج) لە ١٩٣١/١٠/١٨ ئەو کاتەی تەمەنی ٨٤ ساڵ بوو، بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان کرد، ئیدی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەو ڕۆژەوە ڕووناککەرەوەی گڵۆپەکانیان کوژاندەوە بۆ هەمیشە ماڵاوایی لێکردن.



# چوار ڕاسپاردە، له پێناو بەختەوەریی خێزاندا

پڕۆسەی هاوسەرگیری، لە باخێکی دلگیر دەچێت، ئەوانەی بە ناویدا تێپەڕ دەبن، بێبەش نابن لە بینینی دیمەنی جوانو دلفرێن، هەناسەیەکی قولی پڕ لە بەرەکەتیش ئالوگۆڕ دەکەن. بەلێ، دەتوانین بلێین: ژیانی هاوسەرگیری، باخێکە؛ مرۆڤەکان تێیدا دەحەسێنەوە.

گومان لەوەشدا نییە، باخ بەبێ باخەوان نابێت، باخی هاوسەرگیری، دوو باخەوانی دلسۆزی دەوێت، کە لە پێناو جوانیو بەردەوامی باخەکەیاندا، گیانفیدایی بکەن، کە پیاوانو ئافرەتانو ئەم دوانە ئەرکیان ئاسان نییە؛ چون باخەوان هەردەم دەجوولێتو تێدەکۆشێت، بۆئەوەی دڕکو دالّ لە ناو بەرێتو کار لە بەرهەمو جوانیی باخەکەی نەکات.

دیارە لەم بابەتەدا، ڕووی دەم لە یەکێك لە دوو باخەوانەکە دەکەین، کە ئافرەتانن. بە ویستی خودا، ئافرەتان ئاشنا دەکەین، بەو هۆکارانەی کە باخەکەیان، لە ژێر سایەی ئافرەتاندا، ڕەنگینترو جوانتر دەبێتو هەندێك لەو هۆکارانەش دەخەینە ڕوو، کە چەشنی مێرووو نەخۆشییە درمەکان، باخەکە لەناو دەبەن، ئافرەتان دەبێت ئەوە باش بزانن، کە پڕۆسەی هاوسەرگیری، واتای چوونە ناو بەهەشت نییە؛ هەرچی ئارەزوویان لێبێت، هەبێتو بەردەست بێتو چیان ویست، بۆیان ئامادە بکرێت، سروشتی ژیان وایە؛ دونیا پڕە لە بەرزو نزمیو ناخۆشیو تاقیکردنەوە.

سروشتی ژیانی ژنو مێردیش وایە، بە کۆمەلێك جیاوازیی بیرو ڕاو هەلسوکەوتدا تێپەڕ دەبێت، ئافرەتی داناو لێهاتوو، ئەم ڕاستییانە لە بەرچاو دەگرێتو هێندە ئاستەنگ بۆ خۆیو خێزانەکەی درووست ناکاتو خاوەنی هونەری ئارامگرتنەو لەسەرخۆیانەو بە چاوێکی پڕ لە هیواوە، لە ڕووداوو کێشەکانی خێزانەکەی دەڕوانێت؛ چونکە لەوانەیە، هەلەیەك ژیان بشێوێنێتو دواتر پەنجەی پەشیمانی پێ بگەزێت.. لە بەرامبەریشدا ئافرەتانێك هەن، لە مامەلەکردن لەگەلّ کێشەکاندا، لێهاتوو نینو لە داخوازییەکانیاندا لەسەرخۆو ئارامگرنینو دەیانەوێت ئەو شتانەی کە خۆیان دەیانەوێت، هەر ئەوە یاسا بێتو بچەسپێنرێت بێ کەمکردنو زیادکردن، بۆیە لە کاتی بوونی هەر کێشەیەکدا، چارەسەرێکی گونجاویان پێ نییەو تووشی سەختییەکی زۆر دەبنەوە لە ژیانداو پاشان سکالای حالّی خۆیان دەکەن، بۆ هەردوو جۆرە بیرکردنەوەکە، چەند ئامۆژگارییەك دەخەینە ڕوو، بەو هیوایەی جێگەی سوودو کەلك لێوەرگرتن بێت.

١. گرنگیدان بە ئایینو بیروباوەڕی خۆت، کە ڕێگە خۆشکەرە، بۆئەوەی ئاشنای مافەکانی خۆت ببیتو مافی هاوسەرەکەشت پێشێل نەکەیتو لەو ڕێگەیەشەوە ئاشنای ژیانی دایکی ئیمانداران دەبیتو دەزانیت، کە ئەم ئافرەتە بەڕێزە، چۆن ئارامی گرتووە، لە کاتی بوونی ناخۆشیو نەبوونیدا، چۆن هەردەم پالپشتی پەیامبەر بووە، لە گەیاندنی پەیامەکەیدا.

پاشان یارمەتیی هاوسەرەکەت بدە؛ لە ناسینی خوداو ئەو پەیامەی کە پێغەمبەر هێناویەتی، مندالّەکانیشت ئاشنای پەرستشەکان بکەو ئەرکو بەرنامەی ڕۆژانەیان بۆ دیاری بکە، پاش ئەنجامدانی ئەم کارانە، بەویستی خودا، بەختەوەرییەك ڕوو لە خێزانەکەت دەکات، کە هاوشێوەی نابێت؛ مەگەر کەسێك وەك تۆی ئەنجام دابێت.. دەزانیت چ هەستێکی خۆشە؛ مالێك لێوان لێو بێت لە باوەڕو وتەی شیرین، بەڕاست بە ختەوەری لەو مالەدا، هەواری خۆی هەلدەدات، هەمیشە لە پشت هاوسەرەکەت بە لە ناخۆشییەکانداو هانی بدە؛ جگە لە خودا، پەنا بۆ شتی دی نەبا، کە توانایان نییە، سوور بە لەسەر ئەوەی هاوسەرەکەت، مافەکانی خودا، جێبەجێ بکات، گەر توانیت ئەم کارە بکەیت، دلنیابە بۆ خۆتت کردووە، چونکە هەر کەس ئاگاداری مافی خودا بێتو بیناسێت، هەرگیز مافی دەوروبەری پێشێل ناکاتو خۆشیو

ڕەحمەت دەڕژێت بەسەرتاندا.

٢. هۆکارێکی دی، کە دەبێت ئافرەتان بیگرنە بەر؛ لە پێناو بەختەوەربوونیاندا، بریتییە لە: خۆشویستنی ڕاستەقینەی هاوسەرەکانیان، چونکە خۆشەویستی، کلیلێکە هەموو دەرگا داخراوەکان دەکاتەوە، بۆیە هاوسەرەکەت، لە خۆشەویستی بێبەش مەکەو مەهێڵە کەسی دی جگە لەو، لە لات خۆشەویست بێت، ئەمەش بە ئاشکرا بۆ هاوسەرەکەت دەربڕە، گەر هاوسەرەکەت درکی بەم هەستەی تۆ کرد، ئیدی کێشەکان دەتوێنەوەو تارماییەکان بۆ خۆیان کۆچ دەکەن؛ چونکە خۆشەویستی لە هەر کوێدا بێت، لەوێ ئارامی هەیە، تەبایی‌و ڕێزگرتنیش لە شوێنێکدا خۆی دەسەپێنێت، کە خۆشەویستی بوونی هەبێت.

خۆشەویستی، بکوژی ناپاکییە، ڕەنگە هیچ بەڵایەك، وەك ناپاکی ترسناك نەبێت، تووشی هەر خێزانێك بێت، وەك گەڵای پاییز، ئەو ژیانەیان لێ هەڵدەوەرێنێت، بۆیە خۆشەویستی لە نێوان هاوسەرەکاندا، بە ویستی خودا، ئەم پەتایەش، لە کۆڵ دەکاتەوە.

٣. لە ڕەحم‌و بەزەیی تۆوە نییە ڕەخنە بگریت لە ڕزق‌و ڕۆزیی هاوسەرەکەت‌و نارازی بیت؛ بەو شتانەی کە ناتوانێت بۆت دابین بکات، یاخود گاڵتە بەکارو پیشە، یاخود پلەو پایەیی کۆمەڵایەتیی هاوسەرەکەت بکەیت؛ چونکە گەر واتکرد، ئەوا بە دەستی خۆت، چرای خۆشەویستی، کز دەکەیت‌و درز دەخەیتە ناو ژیانی هاوسەریشتانەوە، هەمیشە ڕازی بە بەوەی کە لەبەردەستتدایەو بۆت دابینکراوە، هاوسەرەکەشت لەوانەیە؛ هەر هێندەی پێ پەیدا بکرێت، خۆشت بە دوور بگرە لە لاساییکردنەوەی ئەو ئافرەتانەی کە لە ڕووی ئابوورییەوە لە ئێوە باشترن‌و فشار لە سەر مێردەکەت درووست مەکە؛ هەتا ئەو شتانەت بۆ دابین بکات، کە دراوسێکانتان، یان نزیکەکانتان هەیانە؛ چونکە ئەم حاڵەتە، سەرچاوەی درووستکردنی قەیرانە، ئافرەتی ژیر، بۆ چەند شتێکی لاوەکی، پەیوەندیی خۆی لەگەڵ مێردەکەیدا، ناخاتە مەترسییەوە.

٤. وشە نەرێنییەکان لە خەیاڵتدا دەربکە، ڕێگە مەدە پەرە بسێنێت‌و لە فەرهەنگی ژیانتاندا، وشەی جیابوونەوەو ئاستەنگ‌و گومانی بێبنەما بسڕنەوە، بۆ تەنها جارێکیش، بیری لێ مەکەنەوە؛ چونکە ئەم وشانە، خۆرەی ژیانن، ئێوە دوو مرۆڤن، بۆ تەواوکردنی پێویستییەکانی یەکدی، گرێبەستتان کردووە لە دەست ناخۆشی‌و بەڵاکانی دونیا هەڵهاتوون‌و هاتوون ژیانێك درووست بکەن؛ ئاسوودە بن تێیدا، نەك کێشەو ناخۆشییەکان زیاتر بکەن، تۆی ئافرەت، دەبێت بزانی هاوسەرگیری، واتا: ژیان‌و نوێبوونەوە، واتا: بیرکردنەوەی دوو کەس، بۆ یەك ژیان. هەوڵ بدە؛ ئەو وشانە بەکاربهێنیت، کە هاوسەرەکەت حەز بە بیستنیان دەکات‌و خۆت لەو وشانە بپارێزە، کە هەستی مرۆڤ بریندار دەکەن، گەر لەیەکدی بگەن، ئەوا ژیانتان زۆر جیاواز دەبێت، لەو ژیانەی کە زۆرێك لە خەڵکی بە دەستییەوە دەناڵێنن، کێشەکانی خێزانی ئەمڕۆ، تەنها تێنەگەشتنە لە ئامانج‌و بنەماکانی هاوسەرگیری، گەرنا پێکەوەژیانی دوو مرۆڤ، هێندەش ئاستەنگ نییە، گەر جیهانبینییان وردو فراوان بێت.

# ماندووین، نیشتمان!

سایە سەرگەتی

نیشتمانەکەم سڵاو، دەمێکە پێکەوە تەنیا نەبووین، بیری ڕۆژە خۆشەکان دەکەم، ئەو ڕۆژانەی کە تەنیا لە خەیاڵی منو تۆدا بوونیان هەیە، ئەو ڕۆژانەی منداڵی، کە بەڵێنت پێ دەدام پێکەوە گەورە بین، ئەی کوا شازادەکەم؟ خۆمن ئێستا گەورە بووم، بۆ تۆ هێشتا منداڵیت؟ بۆچی هێشتا حەزدەکەیت یاری بە ئاگر بکەیت؟ ئێستاش وەك منداڵی، ڕێگە نادەیت کەس ئاسوودە بێت، بۆ وا دەزانیت؛ سەرکەوتن لە شەڕدا خۆشە؟ بۆچی خۆت لە شەڕ ناپارێزیت. یان نا، تۆ گەورە بوویت، کێشە شتێکی ترە، بیستم هەر لە منداڵییەوە بێبەخت بوویت، وتیان: لەوانەیە تاوانی خاکەکەت بێت، تۆ بڵێیت، وابێت؟ گەر وایە، هەستە نیشتیمان، باپێکەوە بڕۆینە شوێنێك، تەنها خودا بمانبینێت، شوێنێك، کە خەڵکەکەمان پارێزراوبێت، با ئیتر، هەموو جۆرەکانی کوشتن، لەسەر ئێمە تاقی نەکرێتەوە، باسەردەمی گریان تەواو بێت، من ماندووم نیشتیمان، ماندووم لە بینینی خوێن، لە ناپاکی، ماندووم لە دووبارەبونەوەی مێژوو. نەڕۆین نیشتیمان؟ بێبەختی بوونی نییە؟ زۆر باشە دەمێنینەوە، دەمێنینەوە، بەڵام بەڵێن بدە بەرگری نەکەیت، ئاسایی مەبە، با تۆڵە بکەینەوە، با دۆعا بکەین؛ خۆر لە نیوە شەودا هەڵبێت، ئاخر بۆ بەری بەیان. زۆر درەنگە، بەڵام بە خودا سوێندت دەدەم، ئیتر هاوڕێیەتی کەس مەکە، سەرەخۆشی‌و پرسە لە کەس قبووڵ مەکە، ئەوان ئەزموونیان هەیە، ئەزموونی یاریکردن بە هەمووان، مەهێڵە یاریت پێ بکەن. خۆشەویستەکەم هەموو کەسێك شەرەفمەند مەکە بەسەرکردایەتیت، بە چاوی نەعامە فریو مەخۆ، ئەوان مێشکیان زۆر بچووکە.

کوردستانەکەم، تکایە ئەم جارە هەڵە مەکە، هەمووان لە هەڵەکردن ماندووین، هەوڵبدە، خودا کاری بەردەوامی خۆش دەوێت، با کەمیش بێت، هەمیشە لە بیرت بێت، لە دوای خودا، ئێمە لەگەڵتداین، هەرچەند هیچ شتێکت پێ نەبەخشیوین، تەنانەت ناسنامەیەکیش، بەڵام عاشقتم.



بێگەرد فارس

# لە ماڵەکەماندا یاسا هەیە!

د.عبدالکریم بکار دەڵێت: (لەسەر دایکو باوک پێویستە؛ چاوەڕێی هاریکاریی کۆمەڵایەتی نەبن بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانیان، بەڵکو پێویستە، هەر خۆیان بەتەنها، بەو ئەرکە هەستن)، زۆر جوانە؛ باوان دەستپێشخەر بن لە دانانی چەند یاسایەك لە بەڕێوەبردنی پرۆسەی پەروەردەداو لەناو ماڵدا دابنرێتو هێزێکی زۆرباش بەو پرۆسەیە دەبەخشێت، چەندین یاسا هەیە؛ دەتوانرێت ئەوەی بۆ ماڵی تۆ گونجاوە جێبەجێی بکەیت، بە دڵنیاییەوە، بۆ خێزانەکەت، زۆر سوودبەخش دەبێت، بۆ ئەو پرۆسە گرنگە ئەوانیش:

١- نوێژەکان لە کاتی خۆیدا.

٢- بەیارمەتیت، سوپاس؛ دوو وشەی زۆر پێویستن، وازهێنان لێیان مەحاڵە.

٣- لێدان، وشەی نەشیاو، تانەو تەشەر، یان هەر وشەیەك، هەست بریندار بکات، نابێت بەکاربهێنرێت.

٤- هەر وتەیەك هەیە بۆ دەربڕین، پێویستە بەڕێزەوە بگوترێتو ڕوون بێت.

٥- داخستنی هەر شتێك کرابێتەوە (دەرگا، پەنجەرە .... هتد)، پێویستە دوای تەواوبوونی مەبەست، دابخرێنەوە.. هەر شتێك کەوتبوو، هەڵبگیرێتەوە، بۆئەوەی شوێنەکە، یان ماڵەکە، شپرزە نەبێت.

٦- بەرامبەر ژوورەکەت، بەرپرسیاریت.

٧- گوێگرتن بۆ هەر کەسێك، کە قسە دەکات، تا ئەو کاتەی تەواو دەبێت؛ بەبێئەوەی پێی ببڕیت.

٨- سڵاوکردنو ماڵئاواییکردن لە کاتی ڕۆیشتنو گەڕانەوەدا.

٩- جگەرەکێشان بۆ هەموو کەسێك؛ نزیك، یان دوور، کە بە سەردانیش دێت، بە هەموو شێوەیەك، لەناو ماڵدا قەدەغەیە.

١٠- شەونخوونی نییە دوای کاتژمێر ١٠، بەکارهێنانی نێت، مۆبایل.... هتد، تەنها یەك کاتژمێر دەبێت، ئەویش لە کاتژمێر (..... تا .....) دەبێت.

١١- هەستانەوە لەبەر دایكو باوكو ماچکردنی دەستو سەریان.

١٢- بەکارنەهێنانی هیچ ئامێرێك، لە کاتی پێکەوە دانیشتنی خێزاندا.

١٣- هەموو کەسێك، خۆی خزمەتی خۆی دەکات، نابێت فەرمان بە خزمەتکار بکرێت، بێجگە لە دایكو باوك (ئەگەر خزمەتکار هەبوو).

١٤- ڕوخسەت خواستن بۆ چوونە ژووری هەریەکێك لەوانی دیکە.

١٥- هەموو بەرپرسن لە پاراستنی ماڵو تایبەتمەندییەکانی خێزانەکە.

١٦- ئامادەبوون لە کاتی نانخواردن؛ بەبێ دواکەوتن.

ئەمانەو چەندین یاسای تر، کە تۆ، بۆ خێزانەکەتی بە شیاو دەزانیت، دەتوانیت پەیڕەوی بکەیت، بێگومان سەرکەوتوو دەبیت لەو پرۆسەیە، ئەگەر وەك پرۆژەیەکی گرنگ سەیری بکەیت!





گوڵان حەمەئەمین

بەشی دووەم




# ئادابە کۆمەڵایەتییەکان

خۆشەویستانم، لەم ژمارەیەدا، لە خزمەتی ئێوەی خوێنەردا، بەشێکی دیکە، لەو ئادابە کۆمەڵایتیانە دەخەینە ڕوو، کە زۆر جار، خۆمان سەرنجمان لەو منداڵانە داوە، کە جێبەجێی ئەم ئادابانەیان کردووەو پێیان سەرسام بووین! لۆمەی ئەو دایکو باوکانەشمان کردووە، یاخود بێتاقەت بووین کاتێك منداڵێکمان دیوە، ڕەچاوی ئەم ئادابانەی نەکردووە!

پێویستە لە تەمەنی پێنج ساڵی، تا دە ساڵیدا، ئەم ئادابە کۆمەڵایەتییانە، لە منداڵەکانماندا ڕەنگ بداتەوە.

بۆئەوەی منداڵەکانی ئێمەش، نموونەی ڕێزو شکۆبن‌و سەربەرزبین بە ڕەوشتەکانیان، پێویستە کەمترین هەلمان لەدەست نەچێت؛ بۆ فێرکردن‌و پەروەردەکردنیان.

**ئەتەکێتی سڵاوکردن:**

سڵاوکردن، جوانترین وشەی بەیەکگەیشتنە؛ ئەگەر بە (سلام علیکم ورحمة الله وبرکاته...)بێت، جوانترو تەواوترو پڕ واتاترە، یاخود بە "سلام علیکم"، یا سڵاوی خودات لێبێت، بۆ فێرکردن‌و ڕاهێنانی منداڵیش، لەسەر سڵاوکردن، پێویستە خۆمان سڵاو بکەین، لە کاتی گەڕانەوەمان‌و بەشێوازی جوان، وەڵامی سڵاوی یەکدی بدەینەوە، تا لە ناخ‌و بیر، پاشان لە ڕەوشتی منداڵەکانماندا ڕەنگ بداتەوە.

**کێ لە سڵاوکردندا، دەستپێشخەری بکات؟**

سوار، سڵاو لە پیادە دەکات.. پیادەش، لەوانەی بە لایدا تێدەپەڕێت.. کەم، سڵاو لە زۆر دەکات.. منداڵ، سڵاو لە گەورە دەکات.

پەروەردەکارانی ئازیز، کاتێك دیاری بکەن، تا بتوانن بەوردی، باسی ئەدەبی سڵاوکردن، بۆ ڕۆڵەکان ڕوون بکەینەوە، پاشان پرۆڤەیان پێبکەین لەسەری. بۆ نموونە: بڵێ: بزانم چەند ژیریت، لەمەودوا، چۆن سڵاو دەکەیت؟

کاتێك منداڵەکەت، بۆت باس دەکات، کە سڵاوی لە دراوسێیەك، کەسێك کردووە، قسەکەی پشتگوێ مەخە، باوەشی پێدا بکەو توند لە ئامێزی بگرە، بڵێ: هەربژی، تۆ چەند ژیریت!!! تا بیکاتە نەریتی‌و بەردەوام بێت لەسەری.

**لەپاش سڵاوکردن، مۆڵەتوەرگرتن:**

دیارە ئەمەش کاتێکە، کە بچێتە شوێنێك؛ جا لەماڵەوەدا، کاتێك دەچێتە ژووری دایك‌و باوك، یان خوشك‌و برا... پێویستە فێریان بکەین؛ بدەن لە دەرگا، هەر جارێك بەبێ مۆڵەت هاتە ژوور، بڵێ: ئای! لەبیرت چوو، ڕاکە بدە لە دەرگا، با پێت بڵێم: فەرموو، جا وەرە ژوورەوە. هەموو کات پێی دووبارە بکەرەوە، تا دەبێتە نەریتێکی هەمیشەیی، هەرکاتێکیش خۆی لە بیری بوو، بڵێ: ئافەرین، هەربژیت... هانی بدە لەسەر جێبەجێکردنەکەی.

بەهەمان شێوە، بۆ سەردانی هاوڕێ‌و خزمانیش، با نزیکیش بن، فێری بکە، هەمیشە مۆڵەت وەربگرێت، هیچ کات لە خۆیەوە، نەچێتە ژوور، چاودێری بکە، تا چەند جێبەجێی دەکات، هێندە هەوڵی لەگەڵدا بدە، بە هەڵنان‌و هاندان‌و دەستخۆشی لێکردن.

**شێوازی مۆڵەتوەرگرتن:**

سێ جار لە دەرگا بدات، یاخود زەنگ بەشێوازێکی جوان، هێندە توند نەبێت، کە خاوەنماڵ بترسێت‌و بشڵەژێ‌و دەست لەسەر زەنگ لا نەبات، هێندەش هێواش نەبێت، کە خاوەنماڵ گوێیان لێ نەبێت، لە نێوانی هەرجارێکدا، ماوەیەك چاوەڕوانی بکات، ئەگەر هاتوو، مۆڵەتی پێنەدرا، یاخود وەڵامی نەدرایەوە، دڵی نیگەران نەبێت‌و بگەڕێتەوە.. ئەوە مافی خاوەنماڵە؛ ئایە لەو کاتەدا، بۆی دەگونجێت، یاخود نا.

ئازیزان، بەڵام ئەوەمان بیرنەچێت، کە منداڵ، پێویستی بە کات‌و بە پێشەنگ هەیە؛ بۆ فێربوون گەر هاتوو، لە نێوان دایك‌و باوك، یاخود ئەندامانی گەورەی ماڵدا، جێبەجێ نەکرا، ئەستەمە منداڵیش بەئاسانی فێر ببێت. هۆکارێکی دی، بۆ بەئاسان فێرکردنی، لە دوای پێشەنگێتی، ڕۆڵ نواندنە، یاری لەگەڵدا بکە، لەنێو یارییەکەدا، سەردانی بکەو ئەم ئەتەکێتانە جێبەجێ بکە، ئەویش دووبارەی دەکاتەوە.

**ئەتەکێتی (مجلس) دانیشتن‌و کۆبوونەوە:**

تەوقەکردن، یاخود دەست بەسنگەوەگرتن، کە نیشاندانی ڕێزو خۆشەویستییە، دانیشتن لەو شوێنەی کە جێی دەبێتەوەو جێ بە کەس تەنگ ناکات، یاخود لەو شوێنەی کە خاوەنماڵ بۆی دیاری دەکات. دانەنیشتن لە نێوان دوو کەسدا، مەگەر داوای یارمەتییان لێ بکات‌و مۆڵەتیان لێ وەربگرێت.

**ئەتەکێتی گفتوگۆکردن:**

بەڕێزو وشەی جوانەوە بدوێ‌و فێرکردنی منداڵەکان بەزمانێکی پاراوو وشەی ڕەوان، قسەنەبڕین بە کەسی دی، زۆرنەوتن، دەنگ بەرزنەکردنەوە، زۆر پرسیارنەکردن، ڕاستگۆیی لە وەڵامدا، پرسیارنەکردن لەبارەی شتێکەوە، کە پەیوەندی بەوەوە نییە، لە هەمان کاتدا، ئەدەبی گوێگرتن.

خوێنەرانی ڕێزدار، گومان لەوەدا نییە، کە هەگبەی ئەتەکێتی بەڕێزتان، پڕیەتی لە جوانی، بەڵام گرنگ ئەوەیە؛ بتوانیت منداڵەکانمانی لەسەر پەروەردە بکەین، هیچ کات بۆ فێرکردنی نەوەکانمان، ئەم ڕەوشتانە، بەکەم نەزانین.. دەبینین ئەو منداڵانەی وەها پەروەردە کراون، بەئەدەبەوە مامەڵە دەکەن، چەند بەڕێزو شیرینن لەنێو دڵماندا. کەواتە: بائێمەش هەوڵ بدەین؛ چونکە هیچ شێتێك، بێ هەوڵ بەدەست نایەت.



# فەردە چەڵتووکەکەی دایکم!

ئەندازیار هەردی

ساڵی ٢٠٠٠ بوو، منیش وەکو هەموو هاوڕێیانم، ڕێی هەندەرانو وڵاتی غەریبانم گرتە بەر، ڕۆیشتمو بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوەو بە هەناسەی ساردو چاوی پڕلە گریان باوەشم کرد بە براو باوکمو خوشکو خزمو کەسو هاوڕێیانم، دوایین کەسێك، کە مابوو خوداحافیزی لێ بکەم، ئازیزترینو خۆشەویسترینو باشترینو بەسۆزترین کەسم بوو، بەڵام چارم ناچاربوو، دەبوایە هەرچۆنێك بێت، باوەشی پێدا بکەمو توند دەستەکانی بگووشمو ناوچەوانی ماچ بکەم، دەنگی گریانمان لەگەڵ جریوە جریوی چۆلەکەکانو ئاوازی بولبولەکاندا، تێکەڵ بوو.. ئای چ ماڵئاواییەك بوو ئەو ڕۆژە!؟ ئەو کەسە، دایکی خۆشەویستم بوو، ئەو کات تێگەیشتم، کە خودای میهرەبان، بە هۆی ئەو گەورەییو سۆزەی دایکەوەیە، کە دوای پەرستنی خۆی گوێڕایەڵی دایکو باوکی هێناوەو دەفەرموێت: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾ الإسراء: ٢٣، بۆیە دەڵێن: کەس بە قەد نابینایان، قەدری چاوان نازانن، بەڵێ، ئەوانەی لەسۆزی دایکیان بێبەش بوون، ئەوان دەزانن؛ پێناسەی دایك چۆنەو چییە، بۆیە پێشەوا ئەبوو حەسەنی نەدەوی، کە لەتەمەنێکی زوودا، کە تەنها تەمەنی نۆ ساڵان بوو، باوکی کۆچی دوایی دەکاتو ئەوکات قەڵاو کۆڵەکەکەی ماڵیان، دایکی ئەبو حەسەنی نەدەوی، فێری قورئانی پیرۆزو چەند زمانێکی دەکات، بەدرێژایی مێژوو، زۆر دایکمان هەبووە، کە ڕۆڵی باوکیشیان بینیوە.. بەڵێ، ڕۆیشتمو ڕێگای غەریبیم گرتە بەر، تا چاوم بڕکا، ئاوڕم دەدایەوە بۆ دایکی شیرینم.. بەڵێ، بە ئاواتم گەیشتمو گەیشتمە هەندەران، ڕۆژ هاتو شەو بەدوایدا، وەرزەکانی ساڵهاتنو چوون، ساڵەکان تێپەڕین، تا گەیشتینە ساڵی ٢٠١٠، گەڕامەوە بۆ زێدی خۆم، ئەوکات زانیم، کە دایکم ماوەی چەند ساڵە، واتە: ١٠ ساڵە، فەردە چەڵتووکێکی بۆ هەڵگرتبووم، کە ساڵانە باوکم چەڵتووکی دەکرد، چەندین جار بە دایکم وتراوە، با ئەو چەڵتووکە چاك بکەین، با مێش لێی نەدا، ڕازی نەدەبوو، دەیگوت: تا کوڕەکەم نەیەتەوە، لەم چەڵتووکە نەخوات، دەستی لێنادەم. بەڵێ، چەڵتووکەکەی چاککردو برنجێکی جوانو باشی، بەدەستە ڕەنگینەکانی بۆ سازکردم.

هیچ کەس نازانێت؛ کە ژیان، چی بۆ ئێمە داناوەو پاشەکەوت کردووە، منیش نەمدەزانی، کە دایکە بەسۆزەکەی خۆم، چی بۆ پاشەکەوت کردووم.

بەڕاستی ڕازی ژیان ئەمەیە؛ کە وا تێبگەین هەر ڕۆژەو موعجیزەیەکە، بەهیوای ئەوەی هەموومان، لە دەربڕینی سۆزو خۆشەویستی بۆ دایکمان، کەمتەرخەمی نەنوێنین.



# تامی تاڵی ستەم!

ئەسکەندەر ڕەحیم

دەگێڕنەوە: لە دێرین زەماندا، پاشایەك هەبوو، مامۆستایەکی تایبەتی بۆ کوڕەکەی گرتو پێی گوت: ئەم کوڕەم، مادەیەکی خاوەو هەویرێکی نەرمو شلە، تۆ سەرپشکو ئازادیت؛ چ ڕێگەیەك دەگریتە بەر، تا کوڕەکەم پەروەردە بکەیتو فێری خوێندنو خوێندەواریو شێوازی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی بکەیت.

ڕۆژێکیان پاش ئەوەی وانەکەیان تەواو بوو، مامۆستاکە، لە شازادەی پرسی: لە بابەتەکە گەیشتیت؟

شازادەی منداڵ، بەڕێزەوە گوتی: بەڵێ، مامۆستاگیان!

پاشان مامۆستا، چەند پرسیارێکی لەسەر بابەتەکە لێکرد، شازادەش وەڵامێکی جوانو تەواوی دایەوە.. لەم کاتەدا، مامۆستاکە لێی تووڕەبوو، سێ زللەی توندی لێدا، کە شەقەقەکەی، لە دوورەوە دەبیسترا، ئێش بەدڵو بە ڕوخسارو دڵی شازادە گەیشت، لە ناخەوە حەپەسابوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەمە چییە؟ چی ڕووی داوە، چ تاوانێکم کردووە، تا بەم شێوازە، مامۆستا مامەڵەم لەگەڵدا بکات، خۆ من هەموو پرسیارەکانم، بەتەواویو بەڕاستیو درووستی، وەڵام داوەتەوە.. ئەرکی خۆمم، بەجوانی جێبەجێ کردووە؟!

ئیدی ڕقوقینێك لە دڵیدا، بەرامبەر مامۆستاکەی درووست بوو.

پاش تێپەڕبوونی سێ ساڵ، بەسەر ئەم ڕووداوەدا.. شازادە، لەپاش مەرگی باوکی، بوو بە شای وڵات.. هەر لەگەڵ یەکەم ڕۆژی چوونە سەر تەختی شاهانەدا، ئەو ناهەقیو ستەمەی بیر کەوتەوە، کە مامۆستاکەی، بەبێ تاوان لە هەقیدا کردبووی.. لە دڵی خۆیدا گوتی: ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە، ئێستە کاتی تۆڵەکردنەوەیە، تۆڵەکردنەوەی ستەملێکراو لە ستەمکار.. پاشان بانگی سەرۆکی پاسەوانەکانی کرد، ئەویش گوتی: بەڵێ، جەنابی پاشا، فەرمانت بەچییە؟

پاشا گوتی: هەر ئێستا، چەند پاسەوانێکت بنێرەو فلان مامۆستا، بهێننە ئێرە.

دواتر ناردی بەدووی شەللاقوەشێندا، تا ئامادەی جێبەجێکردنی فەرمانی دادگاییەکەی بێت.

کاتێك مامۆستایان هێنا، لەبەر پیری، پشتی کووڕ ببوو، پاشا بەئاماژە، بە شەللاقوەشێنەکەی خۆی گوت، ئامادە بێت بۆ فەرمانی.

دواتر پاشا، ڕووی کردە لای مامۆستاکەو پێی گوت: دەزانیت؛ بۆچی تۆمان هێناوەتە ئێرە؟!

مامۆستاکە بەهێمنی گوتی: بەڵێ، پاشای مەزن.

پاشا گوتی: بۆچی ئەو ڕۆژە، ئەو ستەمو ناهەقییەت لە هەقی مندا کرد؟! بۆچی ئەو زللانەت لێدام؟!

مامۆستاکە، بەوپەڕی داناییەوە گوتی: ئۆۆۆۆهـ، سێ ساڵی ڕەبەق دەبێت، هێشتا ئەو زللانەی لێم داویت، لەبیرت ماونو قینی ئەو ناهەقییەت، تا ئەم ساتە، لەدڵ گرتووە؟! من لەبەرئەوە ئەو کارەم کرد، تا تامی تاڵی ستەمت پێ بچێژمو بۆ خۆت هەستی پێ بکەیت، کە ستەم، چەندە ناخۆشە، هەروەها بزانیت؛ ستەملێکراو، هەرگیز ئەو ستەمەی لێی دەکرێت، لەبیری ناچێت.. گەر نەشتوانێت، وەك ئێستەی تۆ، تۆڵەی بسەنێتەوە، ئەوا ڕوو لە دەرگانەی خودا دەنێتو نزاو کزۆڵیو کزەی دڵی، بۆ خودا هەڵدەڕێژێت، لەنێوان خوداو نزای ستەملێکراویشدا، پەردەو ڕێگرێك، لە گیرابوونیدا نییە. جەنابی پاشا، من دەمزانی؛ ڕۆژێك دادێت، لەپاش بابی بەڕێزت، دەبیت بە پاشای وڵات، ئەو کارەم بۆئەوە کرد، تا لە سەردەمی دەسەڵاتی خۆتدا، ستەمو ناهەقی لە هیچ کەسێك نەکەیتو لەگەڵ خەڵکیدا، دادپەروەری بکەیت بە پیشەی خۆت!

پاشا، کە ئەمەی بیست، بەسەرسوڕمانەوە گوتی: تۆ لەبەر ئەمە، ئەو کارەت کرد، کەواتە تۆ وانەیەکی گەورەت فێری من کرد، ئەویش ئەوەیە کە هەرگیز ستەم لە کەس نەکەم.. من زۆر سوپاست دەکەم، هەتاکو مردن، سوپاسگوزاری تۆم، پاشان خەڵاتێکی شاهانەی بەخشی بە مامۆستاکەی!



# بۆچی هاتم

گەرمیانی

لە کازیوەیەکـــی نۆبەرەی بەهارێکــی نوێدا، هەنگاوم دەنا بۆ حزوورت، قۆناغم دەبڕی بۆ دیدارت، دەزانم ئێســـتا هەنگاوەکانم، بە ترپەی دڵت دەژمێری، نەك بە چرکەژمێری کاتژمێرەکەت، وەك چۆن من، بە بۆنی میســکی هەناســەت، دەزانم شازادەکەم بەرەو دەڤەری ڕۆحم هەنگاو دەنێ!

ئازیزم، من نەهاتووم شـــتێکی نوێت بدەمێ، من تەنها بۆ ئـــەوە هاتـــووم، بـــە جوانییەکانی خۆت ئاشـــنات بکەم، جوانییـــەك، کە پێشـــتر نەتدەزانی لە تۆدا هەن، کەســـیش نەیدەزانی، تا پێت بڵێ!

بـــە دیـــــدارت، ئـــەگـــەر تـــارێ لـــە زوڵـفـت بە موڵکی "کەی" بدەم، یا تەختی "دارا" -ئەدەب-

خۆ منیش، وەها بە ئاســـانی، نەگەیشـــتمە ئاستێك، تا بتوانم شـــەرحی ڕموزی جوانیت بکەم، تەلیســـمی ســـیحری جەمالت بدۆزمەوە! بتوانم لە وەســـفی ڕوخسارێکا بنووسم، کە وەکو تاهیر بەگ دەڵێ:

فەلەك زانی، کە دەشکێ؛ ڕەونەقی بازاڕی مانگو خۆر
شکاندی پەنجەکەم، تا من نەنووسم وەسفی ڕوخساری

ڕوخسارو پەرچەمێك، کە وەکو ئەدەب دەڵێ:

ڕوومەتت بەدری مونیرو پەرچەمت وەك میشکی ناب
لـــەو خەجـــڵ ما ئافتـــابو لەم شـــکا، قـــەدری گوڵاب

جەماڵێك، كە "نالی" بڵێ لە وەسفیدا:

شكافێكە كلافەی نافی زوڵفت
دەڕێژێ میسكو عەنبەر، لێرە تاچین
لەسەر بەرگی گوڵێكی باغی حوسنت
هەزار، گوڵچینی بێبەرگو نەوا،چین
ئەتۆ میهرىو مەهروویان ستارەن
لە خزمەت شەوقی تۆدا، شەوچرا چین؟!

من هاتووم؛ فێربم، قوتابییم، نەك مامۆستا.. موریدبم، نەك شێخ.. شاگردبم نەك حەكیم!

هەرگیز وا نەزانی هاتووم، تا بتكەم بەخۆم، نا.. هەرگیز،.... شتی وا چۆن دەبێ؟!

هاتووم؛ ببم بە خۆڵ، تا بگەم بە تۆ.. هەموو تەمەنم بدەم، تا لە دەریای حوسنی تۆدا، بەهرەمەند بم!

حیكمەتی پڕ مەسئەلەی كوڵمت، لە بۆ كێ حەل دەبێ
هەر سەحیفە، سەد ئیشارەو ڕەمزی تێدا جارییە
خاڵی ڕوخسارت، هیدایەتبەخشە، شەرحی زوڵفەكەت
قازی ئاسا، حاشییەی ئەگریجەكانت لارییە
ڕووت وەكو ئاتەش، موژەت وەك شیشە، ئەبرۆت قیمەكێش
میروەحەت زوڵفو كەبابت، جەرگی پارەی "ناری"یە

هەرچەندە ئازیزم، خۆشەویستی نابینرێ، ناخوێنرێ، ناتوانین بیكرین، ناتوانین فێری بین، ئەوە نیعمەتێكی خوداییە، فەیزێكی ئیلاهییە، خوداوەند دەیخاتە نێو دڵەكان، بە لوتفی خۆی، ڕۆحەكان بە یەكتر ئاشنا دەكا، دڵەكان لە یەكدا دەتوێنێتەوە! نوورێك بە دڵەكان دەبەخشێ، كە ئیدی، هەرگیز ڕێگا ون ناكەن!!

ئاسودەییەك دەدۆزنەوە، كە ئیدی، هەرگیز ناتوانن دەستی لێ هەڵبگرن!!

منیش بۆ ئەوە هاتمە حزوورت، تا لە جیهانێكدا بژیم، كە هەموو كەس لەوێدا، تاجی پاشایەتی لەسەر دەكەن! ئیدی باسێك، لە دونیاو ماددەپەرستی نامێنێ، لەوێدا ئیدی، پێویستت بە كەسو بە هیچ نییە!

بیر لە هیچ ناكەیتەوە! نیگایەك هەموو مەتاعی دونیات، لە بیر دەباتەوە!

هاتم؛ تا لەسەر ئەژنۆ، لە خزمەتتدا، وانەی ئەوین بخوێنم، چ فەزڵێكی گەورەیە؛ گەیشتن بە دیداری ئوستادی دڵ! من ئەمەم بە خەو، بە ئاوات دەخواست!

شەوێ لەیلا بە مەجنونی، وەها وادەی تەماشا دا
دەبێ ڕۆژێ ببینی من، كە تۆ ڕێخەیتە ، دەشتی خەو -مەحوی-

هاتم؛ تا چیدی، دڵم لە سەحرای تەنیاییدا، لە سەرما هەڵنەلەرزێ! هاتم؛ تا چیدی سۆمای چاوم، لە چاوەڕوانیدا نەتوێتەوە! هاتم؛ تا چیدی دەستەكانم، نەبن بە تەوقی ئەژنۆم! هاتم؛ بۆئەوەی نەمرم، هەناسە بدەم، بژیم....

ڕاستتر بڵێم.. هاتم؛ تا جارێكی دی، لەدایك ببمەوەو تامی ژیانی ڕاستەقینە بكەم!!

گەر دزێو بێ؛ دیمەنی ژینگە، ئەوین جوانی دەكا
خۆشەویستی، سەد برینت لێ بێ، دەرمانی دەكا
دەردو ژانە ژین، ئەگەر هیوایەكی تێدا نەبێ
گەر قەڵای دڵ ساردوسڕ بێ، ڕوو لە وێرانی دەكا -هێدی-

ئەو كاتەی باسی ئەوینی تۆ دەكەم، هەموو دنیا بۆنی تۆ دەگرێ، دڵۆپێك لەو گوڵاوە بەسە بۆ گوڵاوپرژێنی هەموو دنیا، ئەوە عەبیری بەهەشتە، میسك و ڕێحانی فێردەوسە، من بەو عەبیرە خۆم شۆری، پاك بوومەوە، بەرزبوومەوە بۆ كەشكەشانی فەلەك، تەنها ئەوینی تۆ توانی من بشواتەوە، لە هەموو گوناهێك پاكم كاتەوە، هیچ مامۆستایەك نەیتوانی هێندەی چاوەكانت فێرم بكا، من قوتابی چاوەكانی تۆم، بۆیە كە دێمە حوزورت حەز ئەكەم تەنها تەماشای نێوچاوانت كەم، بۆم كرابا نەمدەهێشت پێڵوی چاوەكانت لێك بنێیت! تۆ بوویت سەرابت بۆ كردم بە دەریا، خەیاڵت بۆ كردم بە حەقیقەت!

ژیانت كردم بە خەونو خەونت بۆ كردم بە ژیان! تۆ بوویت بێ وشە، لەگەڵم دوایت، بێ دەرگا هاتیتە ژووری دڵم!

پێش ئەوەی تەشریف بهێنیت، هەموو شوێنەكان تاریكبوون! هەموو تەمەن بە هەدەر دەگوزەرا!

هەموو هیواكان زەردو ژاكاوبوون! لە ژێر هەزاران پەڕەی كتێبدا بۆ تۆ دەگەڕام...

چاوەڕوانی كەسێك بووم بێت، دەست بكا بە گیرفانی دڵما!

ببێتە شازادەی مەملەكەتەكەم، ئیمپراتۆری دڵم، ببێتە مێژووم، ئەمڕۆم، ئایندەم!

ئەدی چۆن هەموو عومرم ئاواتی دیداری تۆو حوزوری بەردەركی شاهانەی تۆ نەبێ..

وإنّي لأهوى النّومَ في غيرِ حينِهِ
لعلّ لقاءً في المنامِ يكونُ -قيس لبنى-

حەزدەكەم بە خەو، با كاتی خەویش نەبێ، بەڵكو دیداری تۆم لە نێو خەودا دەست كەوێ! بەڵام خەو كوا؟ وەكو مەحوی دەڵێ:

خەو دەزانێ نییە، دەیوت: دەبنوو بێمە خەوت
نێك بەختم بە وەنەوزێ بكە، ئەی بەختە مەدەد

تەنها شتێك، كە مرۆڤ هەرگیز لێی بێزار نابێ، زیكرو یادو باسی خۆشەویستییەكەی خۆیەتی، بە شێوەیەك لە دژوارترین ساتەكانا، لە نێوان مەرگو ژیانا، لە قوولایی دەردو ژانا، خۆشترین خەیاڵو شیرینترین باسوخواس، باسو خەیاڵی یارە، هەر لەبەرئەوەشە، «عەنتەرە» بە «عەبلە» دەڵێ:

وَلَقَدْ ذَكَرْتُكِ وَالرِّمَاحُ نَوَاهِلٌ - مِنِّي وَبِيضُ الهِنْدِ تَقْطُرُ مِنْ دَمِي

فَوَدِدْتُ تَقْبِيلَ السُّيُوفِ لأَنَّهَا - لَمَعَتْ كَبَارِقِ ثَغْرِكِ المُتَبَسِّمِ

عەنتەرە" لە گەرمەی شەڕو زرەی شمشێرو سروودی مەرگا، "عەبلەی"دێتەوە یاد، كاتێك یادی دەكات، كە ڕمەكان، ڕووی تێدەكەنو شمشێرەكان خوێنی ئەویان لێ دەتكێ!

لەو ساتەدا، لەو دۆخە ناسكو سەختەدا! هەموو شتێ لە یاد دەكا، دەیەوێت دەمبنێ بە دەمی ئەو شمشێرە سپییە خوێناوییانەی، كە دەیانەوێت ڕۆحی لێ بسەننەوە، دەزانن بۆ؟ چونكە ئەو دیمەنە، لە دیمەنی لێوی "عەبلە" دەكا، كاتی پێكەنین!

ئەوە مونتەهای بەڵگەی خۆشەویستیو حەقیقەتی زیكرو یادی مەحبووبە!

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ الأنفال: ٤٥

خوداوەند فەرمان بە باوەڕداران دەكات، كاتێ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ دوژمن، ئارام بگرنو یادی خودا زۆر بكەن، تا سەركەوتوو، سەرفراز بن!

ئیدی چی باسێك، لە باسی مەحبووبی گەورەی دڵ؛ خوداوەند، خۆشترەو چی وتەیەك لە زیكرو فیكری ئەو، شیرینترە!؟

یادی خوداو مەقامی خۆشەویستی خوداوەندو گەیشتن بە مەحەببەتی ئەو زاتە گەورەیە، قووتی دڵو ژیانی ڕۆحو خۆراكی گیانە، نووری چاوو تیشكی خۆری ئیمانە! دەرمانی دەردی دڵو گیانە، بێ ئەو ژیانە، ڕۆح مردووە، بێ ئەو نوورە دنیا تاریكستانە، بێ ئەو شیفایە، نەخۆشیو دەردو بەڵا، لاشە دەڕزێنێو بێ ئەو لەزەتە، ژیان دەبێتە دۆزەخ!



# نامە نوورینەکان

ع.ش.شێرکۆ

بۆ ئـەو خۆشەویسـتییە، ناگەینـە مەنزڵـی ڕۆح، بۆنی بەهەشت ناکەین، ناتوانین ببینە ڕێبواری ڕێگای خودا!

بەڵام کاتێ وەکو ئیبنولقەیم دەفەرموێ: داری خۆشەویستی خـودا، لە دڵدا ڕووا، بـە ئاوی ئیخلاصو موتابەعـەی پێغەمبەر (صلّی الله علیه وسلّم) ئـاو درا، میوەی جۆراوجـۆر، بەرهەم دێو بەردەوام بە بەرهەمە، بە ویستی خودا، ڕەگی لە نێو دڵو لقیشی، دەگاتە سیدرەتولمونتەها!

خۆ ئەگەر بچینە سەر تاریفی "خۆشەویستی"، هەرچەندە "ئیبنولقەیـم" پێـی وایە، کە هیچ پێناسـەیەك ڕوونتر نیە بۆ خۆشەویستی لە وشەی "خۆشەویستی خۆی"، وەلێ دواتر، "30" پێناسە بۆ خۆشەویستی باس دەکات، لەوانە:

یەکـەم: خۆشەویسـتی، مەیلـی بـەردەوام، بـە دڵـی وێڵو سەرگەردان.

دووەم: پێشخسـتنی خۆشەویست، بەسەر هەموو شتەکانی دیدا "إیثارُالمَحبوبِ، عَلَى جَمیعِ المَصحوبِ."

سـێیەم: هاوڕابوون لەگەڵ خۆشەویستو گوێڕایەڵیکردنی لە کاتی ئامادەییو ئامادەنەبوونیدا.

چوارەم: سـڕینەوەی هەموو سـیفاتی خـۆتو توانەوە لە خۆشەویسـتیدا.. بە شـێوەیەك، کە خۆشەویسـتت لەبەر خودی خۆی خۆشدەوێو بەس!

پێنجـەم: ڕازیبونـی دڵ، بە هەموو ویسـتو فەرمانەکانی مەحبووب.

شەشەم: لەگەڵ ئەنجامدانی ئەوپەڕی خزمەتو ملکەچیدا، هەمیشە ترسان لەوەی، وەکو پێویست ڕێزو حورمەتی مەحبووبی نەگرتبێ!

حەوتەم: بە کەمزانینی زۆری خۆتو بەزۆر زانینی کەمیی خۆشەویسـتت، چونکە خۆشەویستی ڕاسـتەقینە هەرچی بکات، بۆ خۆشەویسـتیو ئەگەر ڕۆحی خۆشی ببەخشێ، هەر بە کەمی دەزانێو شـەرم دەکات؛ باسـی بکات، بەڵام ئەگەر کەمترین شتی دەسـکەوێ لە خۆشەویستی، ئەوە زۆر بە گەورەی دەزانێو زۆری پێ زۆرە! وەکو ئەبو نەسری میکیالی دەڵێ:

قَلیلٌ مِنكَ یَكفِینِي، وَلكِنْ قَلیلُكَ لا یُقالُ لَه قَلیلُ

هەشـتەم: بـەزۆر زانینی گوناهـو تـاوانو بەکەمزانینی تاعەتو ملکەچبوونو عیبادەتت!

نۆیـەم: خۆشەویسـتیو دەسـتلەملانبوونی تاعەتـی مەحبووبو دوورکەوتنەوە لە سەرپێچیکردن.

دەیـەم: زاڵبوونی یادو سـیفاتو ناوی مەحبووب، بەسـەر دڵیداو داگیرکردنی هەستو نەستو خەیاڵی.

یانزەیـەم: بەخشـینی هەمـوو شـتێ بە مەحبـووب، بە شێوەیەك، کە هیچت نەمێنێ!

دوانزەیەم: خۆشەویسـتی ئەوەیە، کە لە نێو دڵت، جگە لە مەحبووب، کەسی دی نەبێ، وەکو نالی دەڵێ:

شـەقی کـە، غـەیری حـوبـی تـۆی تـێدا بێ
بـە دەسـتـی خـۆت دڵـم دەربـێـنـە قـوربان

سـیانزەیەم: بەردەوام گازندە لە خۆت بکەیتو هەرگیز لە کاری خۆت ڕازی نەبیت، کە بۆ خۆشەویستی دەکەی!

چواردەهـەم: دەبێ غیـرە بکەی لـە مەحبووبەکەت، کە کەسێکی دی هەبێت، هێندەی تۆی خۆشبوێ!

پازدەهەم: ئەو ویستو ئیرادەیەیە، کە لە نێو دڵدا ڕوواوەو بەرهەمەکەشی مورافەقەتو ملکەچبوونە بۆ مەحبووب!

شـازدەهەم: دەبێ خۆشەویسـت، بەشـی خـۆی فەرامۆش بـکاتو هیچ داوایەکی لە بیر نەمێنێو جگـە لە مەحبووب، نە هیچی لەبیر بێو نە داوای هیچ بکات!

حەڤدەهەم: دوورکەوتنەوە لە هەمو خۆشیو ئاسوودەییەکی دڵ، جگە لە خۆشیو ئاسوودەیی گەیشتن بە خۆشەویست.

هەڵبەت هەموو ئەمانە، شوێنەوارو بەرهەمی خۆشەویستین، نەك تاریفو پێناسـە، چونکـە هەروەکو دەڵێن: پێناسـەکردنی خۆشەویستی، زەحمەتە.. ئەگەر ئێمە پێناسەی بکەین، سنووورداری دەکەیـن، ئەو کارەش نابێت، چونکە خۆشەویسـتی، بێسـنوورەو هەرگیز سنووری بۆ دیاری ناکرێت.

هەموو ئەمانەش، کە باسـمان کرد، پێویسـتیان بە شەرحو ڕاڤەو ڕوونکردنەوە هەیە، وەلێ نەك تەنها بە قسەو بە گوفتار، نا ئازیزم، خۆشەویستی بە خوێندن، ناخوێندرێ.. بە وشە، گوزارشتی لێوەناکرێت.. ئێمە ناتوانین کەس فێری خۆشەویستی بکەین!

بەڵکو دەبێ مرۆڤ، بە دڵو ڕۆحی، مومارەسـەی بکات! بە کردارو سـلوك، لە خۆشەویسـتی خودای گـەورە تێبگاتو ڕێگای ئەوینی خودایی بگرێت، چون خۆ ئاسان نییە نێوت ببێتە وێردی مەملەکەتی ئەعلاو بێژن، وەها بەندەیەك، خۆشەویستی خودایە!!

چونکە ڕێگای خۆشەویسـتیی خـودا، تەنها بۆ ئەوە نییە، کە تۆ خودات خۆشـبوێو خودا "محبوب"ی تۆ بێ، وەها کارێك، خۆ زەحمەت نییە!

وەلـێ دەبێـت تـۆش ببیتە "محبـوب"ی خـودا! ئەمەیە مونتەهای ئەمەل!

ئەمەیان سەختە! خودا خۆشەویستی تۆ بێ، خۆ عەجەبێ نییە! وەلێ گەر تۆ "محبوبی" خودا بی، ئەمەیە عەجەبو ئەمەیە گەورەیی! وای لە نیعمەتی گەیشـتن بـەم مەقامە گەورەیە؛ ﴿ یُحِبُّهُمْ وَیُحِبُّونَهُ ﴾ المائدة: ٥٤

لە نامەی داهاتوومدا لەگەڵ خاڵەکانی دی، خۆشەویسـتیو تاریـفو شـوێنەوارەکانی بـەردەوام دەبیـن، بە ویسـتی خودا! دەتسپێرم بە خودا............



# لەگەڵ هەیبەتی شاعیردا

**لە دەشتی شارەزووری دڵ، غەمی تۆ، خێڵ لەسەر خێڵە لە زەڵمو تانجەرۆوە، دەمرفێنن، تا بیاوێڵە وەلێ گەر بیشمرم، بەم حاڵەوە، قوربانی خاڵت بم نییە ڕووی هاتنەوەی لای تۆم، نەفەرمووی تابیا، وێڵە**

شاعیر ناوی «سید محمد صادق حوسەینییە»، ناسراوە بە «هەیبەت»، ساڵی ١٨٧٤ی زایینی لەدایك بووەو ساڵی ١٩٣٤ لە ناوچەی سەقز، کۆچی دوایی کردووە.

شاعیر خوێندنی فەقێیەتی تەواو کردووەو ئیجازەی لە زانستە ئیسلامییەکاندا وەرگرتووەو لای زۆربەی مامۆستاو زانایانی سەردەمی خۆی، خوێندویەتی. شاعیر، بە هەرسێ زمانی کوردیو عەرەبیو فارسی، شیعری نووسیوەو خاوەنی دیوانێکی شیعرییە، کە تازە چاپکراوە.

ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرە جوانو ناسکەکانی شاعیر.

**لە ژێری پەرچەما، هەر شاردتەوە نوقڵی دەمت زانیم لە تاریکستانی زوڵفا، لێوەکانت ئابی حەیوانە قەوی بادامی چاوت، نەرگسی پەست کردو بۆی زوڵفت بە یەك دەفعە، شکاندی ڕەونەقی بازاڕی ڕەیحانە هەسارەی گۆشەوارەت، عاشقی ڕووتە لەوەو نووری پەیاپەی پێ دەگا، بۆیە وەها لەرزانو ڕەخشانە وەها چاوت خومارە، قینو قارە ئارەزووت، ئێژی هەر ئەم لەحزە لە ڕێوە، تازە هاتویتەو لە مەیخانە دوو کوڵمە ئاڵەکەت، بەندی دڵی عاشق بووەو بەندە وەنەوشە خاڵەکەت، ئینسانی عەینە، عەینی ئینسانە**

## ڕۆحم بە فیدایەت

ئاخ کەس نییە؛ بۆ قوربەسەری دوور لە وەلایەت مەحرەم بێ، لە لای یارەوە، دەس کا بە شکایەت ئەو دەسیە، کە خرخاڵی جوان کردووە، ماچ کا دامانی گرێو پێی بڵێ؛ ڕۆحم بە فیدایەت ئەم بولبولە خوێنین دڵە، شێتی گوڵی ڕووتە غەیری ئەمە، ئیتر نییەتی جورمو جینایەت هەرچەندە نییە، لایەقی لوتفی تۆ وەلیکەن چون نازمی ئەو سافتە، لازمیە ڕیعایەت زۆر بێکەسە مەیلاً بمرێ، پێی بکە ڕەحمێ گەر زوڵمە، وەگەر تەجروبە، هێناتە نهایەت لەو وەختەوە عاشق بە ئەوم جاهلی سرفم لایەعقیلو مەستم، نیەسم عیلمو درایەت ناپرسی، کە چاوم نییە، نووری چییە دەردی شوعلەی خوەری گۆنای ئەوە، کردوویە سەرایەت باکم نییە، حاشای بێ لە خوێنم لە قیامەت پەنجەو دەسی ڕەنگینی لە بۆ دێنمە شایەت یا ڕەب، کەی ئەبێ فەسڵی چنینی گوڵی وەسڵی حوزنم وەکو حوسنی، سەری دەرچووگە لە غایەت هەیبەت گلە زۆرەو قەڵەمیش کوندە زوبانی ساتێ بخەوە، نیمەشەوە بەسیە حەکایەت